# چۆنێتی
# ڕۆژووی پێغەمبەر ﷺ
# لە ڕەمەزان دا

نووسینی :
سليم الهلالي و علي حسن علي عبد الحميد

وەرگێڕانی
مامۆستا عدنان بارام

چاپی سێیەم

=====================================

لەبڵاوکراوەکانی

 ماڵپەری بەهەشت 

www.ba8.org

 islam_kurd_ba8@yahoo.com

 07701517378

عێراق - کوردستان - کەلار

هەمیشە لەگەڵمان بن بۆ بەرهەمی نوێ

کتێبی ژمارە ( ١١ )



## پێشەکی وەرگێڕ :

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذُ باللهِ من شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ ... وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ ... وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ .

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾ [آل عمران : ١٠٢].

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴾ [النساء : ١].

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾ [الأحزاب : ٧٠ ـــ ٧١].

أَمَّا بَعْدُ : فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيْثِ كِتَابُ اللهِ وَخَيْرَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ وَشَرَّ الأُمُوْرِ مُحْدَثَاتُها وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ .

**ئەم ووتارەی سەروە ناسراوە بە ( خطبة الحاجة ) [1] پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرەتای هەموو ووتار و ئامۆژگاری و دەرسەکانیدا دەیخوێندەوە ، و هاوەڵە بەڕێزەکانیشی فێر دەکرد - هەروەك چۆن سورەتێك لە سورەتەکانی قورئانی فێر دەکردن - کە ئەم ووتارە لە هەموو بوارێکدا بخوێننەوە ، ئەم بایەخ دانەش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ، بەڵگەیە لە سەر گرنگی ، و گەورەی ئەم وتارە .**

**چونکە ئەگەر ورد بینەوە لە ناوەڕۆکی ئەم ووتارە ، دەبینین هەموو بنەماکانی بیروباوەڕی ئاینی ئیسلامی تێیدا کۆبوەتەوە ، بەڵام ئەوەی کە دەمەوێت لێرەدا تیشکی بخەمەسەر ، برگەی کۆتای ووتەکەیە ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ تیایدا فەرموویەتی :** (( فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيْثِ كِتَابُ اللهِ وَخَيْرَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ وَشَرَّ الأُمُوْرِ مُحْدَثَاتُها وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ )) .

**واتە : چاکترین گوفتار و کەلام ، گوفتار و کەلامی خوایە ، وە باشترین ڕێچکە و ڕێباز و ئاکاریش ، ڕێچکە و ڕێباز و ئاکارەکانی محمدە ﷺ وە خراپترین داهێنراویش ئەو داهێنراوانەن کەخراونەتە سەر ئایین ، و هەموو داهێنراوێکیش لە ئاییندا بیدعەیە ، و هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییە ، وە هەموو گومڕاییەکیش لەگەڵ خاوەنەکەیدا لە ئاگری دۆزەخدایە خوای پەروەردگار پەنامان بدات لە ئاگری دۆزەخ .**

---

[1] هذه الخطبة تسمى : خطبة الحاجة ، وهي التي كان رسول الله ﷺ يفتتح بها جميع خطبه ، ومحاظراته ، ودروسه ، ويعلمها أصحابه ﷺ ، وقد جمع جميع رواياتها ، وألفاظها العلامة الشيخ محمد ناصر الدين الألباني ـرحمه الله في رسالة صغيرة في حجمها ، كبيرة في فائدتها ، بعنوان : (**خطبة الحاجة**) ، فمن أراد الاستزادة فليرجع إليها .

لە مەوە ئەوە تێدەگەین کە بانگەشە کردن بۆ قورئانی پیرۆز و سوننەتەکانی پێغەمبەری نازدارمان ﷺ ، و ئاگادار کردنەوە و وریا کردنەوەی موسڵمانان لە بیدعە و داهێنراوەکان لە ئاییندا ، ئەرکی سەرشانی هەموو ئەو کەسانەیە کەدەڵێین : (( أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله )) ، چونکە بڕگەی یەکەمی ئەم ووتەیە کە : (( لا إله إلا الله ))ە ئەوە لە سەر موسڵمان پێویست دەکات کە تەنها الله ی مەبەست بێت لە هەموو پەرستش و گوفتارو کردارەکانیدا ، و هیچ هاوبەش و هاوەڵێك بۆ الله ئەنجام نەدات ، و تەنها چاوەڕوانی پاداشتی الله بێت ، وە بڕگەی دووەم کە (( محمد رسول الله ))یە ئەوەیان لە سەر پێویست دەکات کە : شوێنکەوتە و گوێڕایەڵی هیچ کەسێك نەبن جگە لە ڕەسولّ الله نەبێت ، لە گەڵ بەڕاست زانین ، و گوێڕایەڵی کردن لە هەموو فەرمانەکانی ﷺ ، لە گەڵ دوور کەوتنەوە لە هەموو ئەو گوفتار و کردار و شتانەی کە قەدەغە و سەرزەنشت کراوون لە ئاییندا ، و نەکردنی هیچ جۆرە عیبادەت ، و پەرستنێکیش بۆ خوای پەروەردگار تەنها بە شەریعەت و سوننەتەکانی ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە نەبێت ﷺ .

ئەمەش پێویستی بە ئەنجام دانی دوو ئەرکی زۆر گرنگ و گەورە :

**یەکەم :** پاڵاوتنی ( التصفية ) .

**دووەم :** پەروەردە ( التربية ) .

واتە : **پاڵاوتن و لابردنی** هەموو پۆخڵەوات خڵتەکانی شیرك و کوفر و بیدعە و تاوان و فەرموودە ( ضعيف ) بێ بنەوا ، و پوچەڵەکان ، ئەو بۆچوونانەی کە بە هۆیانەوە هاتۆتە کایەوە لەناو دڵ و مێشك و گوفتار و کرداری خەڵك و ئەو نووسراوانەی کە دەکەونە بەر دەستی موسڵمانان .

پاشان **پەروەردەکردنی** موسڵمانان لە سەر ئەو ئایینە پاڵاوتە کراوە ، بە تایبەت بە ڕێنمایەکانی قورئانی پیرۆزو سوننەتە صەحیحەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، بۆ ئەنجام دانی ئەم دوو ئەرکە زۆر گرنگ و گەورەیە ، وەك خوای پایە بەرز دەفەرمووێت : ﴿ هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴾ [الجمعة : ٢].

واتە : خوای پەروەردگار بۆ کۆمەڵگای نەخوێندەواران - واتە : زۆرینە نەخوێندەوار - پێغەمبەرێکی ڕەوانە کردووە ، بۆ ئەوەی قورئانیان بە سەردا بخوێنێ و پاکیان بکاتەوە و قورئان و سوننەتیشیان فێربکات ، هەرچەندە لەپێشدا لە گومڕایەکی ئاشکرادا بوون .

خوای پەروەردگار سەبارەت بە بانگەشە و بانگەواز کردن بۆ ئایین فەرموویەتی : ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴾ [فصلت : ٣٣] ، واتە : ووتە و گوفتاری کێ باشتر و ڕاوا

تـره ، و درووسـتره لـه ووتـه‌ی کەسێك کـه بانگەشـه کـار بێـت بـۆ لای خـوای پـەروەردگار و کـرداری چاکەیش ئەنجام بدات و بڵێت من لە موسوڵمانانم .

جا ئەگەر بانگەشە بۆ ئایین پیرۆزترین ووتـه و گۆفـار بێـت و کـرداری پێغەمبـەرانی خـواش بێـت ئەبێ ئەوەمان لە یاد نەچێ ئەم بانگەشەیە ئەبێت لەسەر بنەوای زانست و چاورشۆشنی ئەنجام بـدرێت ، بۆیە خوای گەورە فەرموویـەتی : ﴿قُلْ هَذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ [يوسف : ١٠٨] ، واتە : ئەی پێغەمبەر ﷺ بە ئومەتەکەت ڕابگەیەنە و بڵێ : ئەمەیە ڕێگە و ڕێبازی من ( **ڕێگای ڕاست / الصراط المستقيم** ) ، وە بانگەشە دەکەم بـۆ لای خـوای پـەروەردگار لەسـەر چاوڕۆشنی (واتە: زانستی شەرعی ) ، من وئەوانـەش کـە شـوێنکەوتەی مـنن ، وە پـاکی وبێگـەردی بـۆ خـوا ، ومنیش لە موشریك وهاوبەش بڕیاردەران نیم .

لەم ڕوانگەیە و بۆ زیاتر ئاشناکردنی موسڵمانان بە ( **چۆنیەتی ڕۆژووی پێغەمبەری خوا ﷺ لە رمەزان دا** ) و ناساندنی خەڵکی بە هەندێك ووتەو کرداری بیدعە و داهێنراو لەم پەرستەشدا ( **ڕۆژوو گرتن** ) ، و زیاتر دەوڵەمەند کردنی کتێبخانەی کوردی بەو کتێبانە کە ( **ڕێگای ڕاست** ) بـە خـەڵك دەناسـێنن و زیـاتر سـود بـە موسڵمانان دەگەیەنن ، هەستاین بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە بەنرخە ( **صفة صوم النبي ﷺ في رمضان** ) ، بـۆ سەر زمانی کوردی ڕەسـەن ، داواکـارین لـە پـەروەردگاری مهربانمـان لـە تـەرازووی چـاکەکاری نووسـەران و وەرگێڕ و پێداچووان و ئەوانەشدا بێت کە ڕۆڵیان هەبووە لە بڵاو کردنەوەیدا ، خواش پاداشتی چاکەکاران ون ناکات .

وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

وصلى الله تعالى وسلم على محمد وعلى اله وصحبه اجمعين .

**وەرگێڕ :**

٢٥ / **شەعبان** / ١٤٢٤ هـ

**کەلار**

## پێشەكی نوسەران :

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذُ بِاللهِ مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ .

وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ .

أَمَّا بَعْدُ :

**برای خوێنەر :** خوای پەروەردگار لەگەڵ یەكدا كۆمان كاتەوە لەسەر خۆشەویستی خۆی و شوێنكەوتنی پێغەمبەرەكەی ﷺ لەم پەرتوكەدا بۆمان دەردەكەوێت ڕۆژوو چ پلە و پایەیەكی لە ئیسلامدا هەیە و ، چ ئەجر و پاداشتێك بۆ ئەو كەسانە دەبێ كە بە ڕۆژوو دەبن تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوای پەروەردگار ، زیاد و كەمی ئەو پاداشتەش بەپێی دوور و نزیكی ڕۆژوەكەت دەبێ لە سونەتەكانی پێغەمبەرەوە ﷺ هەروەكو سەروەری كوڕانی ئادەم محمد ﷺ فەرمووتی : " رُبَّ صائمٍ ليس له من صيامِهِ إلا الجوع و العطش "[٢] واتە : ڕەنگە ڕۆژوانی واهەبێ جگە لە برسێتی و تینوێتی هیچی تری بۆ نەمێنێتەوە لە ڕۆژووەكەی .

بۆیە واپێویست دەكات چۆنیەتی ڕۆژووی پێغەمبەر ﷺ بزانین [٣] ، لەگەڵ هەموو ئەو ئاداب وزیكرانەی كە تێیدایە... پاشان گۆڕینی ئەو زانینە بۆ كردەوە لەكاتی بەڕۆژوو بونماندا .

جا بەباشمان زانی لەبەر ئەوەی زانینی ئەو شتانە بە شێوەیەكی تەواو كارێكی ئاسان نیە لەسەر زۆربەی خەڵك ، پەڕتوكێك دابنێین ئەوەی كە لە تواناماندا بێت و تایبەت بێ بە چۆنیەتی ڕۆژووی پێغەمبەر ﷺ لە ڕەمەزاندا كۆ بكەینەوە . بۆ بەهرەمەند بوونی هەموو ئەو موسوڵمان و بڕوادارانەی كە ووتە وكردەوەیان پێش ووتەی خوای پەروەردگار وپێغەمبەرەكەی ﷺ ناخەن .

ئەمە و پاش تێڕوانین بۆ ئەو ئایەت و فەرمووده ( **صحيح** ) ـانەی كە دەربارەی ڕۆژوو هاتوون ، بۆمان دەركەوت كە ڕۆژوو دوو جۆرە :

**١ ـ ڕۆژووی فەرز** .

**٢ ـ ڕۆژووی سوننەت** .

---

[٢] رواه ابن ماجه : ( ١ / ٥٣٩ ) ، والدارمي : ( ٢ / ٢١١ ) ، وأحمد : ( ٢ / ٤٤١ ، ٣٧٣ ) ، والبيهقي : ( ٤ / ٢٧٠ ) من طريق سعد المقبري عن ابي هريرة ، وسنده صحيح .

[٣] لە ناخ و ڕواڵەتیشدا ، چونكە ئەوەی دەردەكەوێت لەسەر ئەندامەكان نیشانەو بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە لە دڵ دایە .

پاشان دوای پشت بەستن بە خوای پـەروەردگار و داوای یارمـەتی لێ کردنـی ڕامـان کەوتـە سـەر ئـەوەی نوسـینەکەمان لەسـەر ڕۆژووی فـەرز بێـت ، چـونکە موسـوڵمان لـە خـوای پـەروەردگار نزیـك نابێتەوە بە شتێك باشتر بێت لەو شتانەی کە لە سەری فەرز کراون ، هەروەکو لەو فەرموودەدا هاتووە کە باسی ئەولیا و دۆستانی خوای پەروەردگار دەکات و ئیمامی ( **البخاري** ) یش لە ( **صحيح** ) ە کەیدا دەیگێڕێتەوە [٤] .

**خوێنەری بەڕێز :** ئەوەش بزانە هەڵگوازینی بیرۆچکەی ڕێکخستنی پەرتۆکەکە و بەشـەکانی بـە پێـی ئـەو قۆناغانەیـە کـە ڕۆژووی پێـدا تێپـەری بـووە ، پاشـان لـە بـەدوای یەکدا هـاتنی کـردەوە و ڕووداوەکانی ئەم پەرستشەیە .

**خوێنەری بەڕێز :** ئەوەی بەرچاوانت دەکەوێت ئەگـەر چـاکەکاری و ڕاسـت بـوو ، ئـەوە لـەخوای پەروەردگارەوەیە ، بەڵام ئەگەر هەڵەشت بەر چاوان کەوت ئەوا لە ئێمـە و شـەیتانەوەیە ، ئێمـەش لـە ژیـان و پـاش مردنیـشمان لێ ی بـێ بـەرین ، و داواکاریـشین لـە خـوای پـەروەردگار یارمـەتی دەرو ڕێنیشاندەریـشمان بێـت لەووتـە و کرداریـشدا ، هـەر ئەویـشە بیـسەری ڕەهـا ، و تـەنها وەڵامـدەری بەندەکانیەتی .

فێرخوازانی زانستی شەرعی

سليم هيلالی و علی حسن علی عبد الحميد

٢٥ ی ڕەمەزانی خێر و چاکە ١٤٠٣ هـ

---

[٤] مەبەستی نوسەران لە فەرموودەی ئیمامی ( **البخاري** ) ئـەو فەرمودەیەیـە کـە (**أبـو هريـرة**) لـە پێغەمبـەری خـواوە ﷺ دەیگێرتـەوە کـە فەرموویەتی : " إن الله تعالى قال : من عادى لي وليا فقد آذنته بالحرب ، وما تقرب إلي عبدي بشيء أحب الي مما افترضته عليه ، ... " الحد يـث ، أخرجه البخاري رقم : ( ٦٥٠٢ ) - وەرگێڕ - .

## چاکەکانی ڕۆژوو :

چـەندەها ئایـەتی ڕون و ئاشـکرای قورئـانی پـیرۆز هـاتوون ، هـانی ڕۆژوو گـرتن دەدەن وەکـو هۆکارێك بـۆ نزیك بوونـەوە لـە خـوای باڵادەست و بـەتوانا ، لەگـەڵ ئامـاژەکردن بـۆ چـاکەکانی ئـەم پـەرسـتنە ، وەکـو : ﴿إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا﴾ [الأحزاب : ٣٥].

واتە : خوای پەروەردگار ... ، وە بۆ ڕۆژووانی پیاوان و ئافرەتان ... لێخۆشبوون و پاداشتێکی گەورەی بۆ ئامادە کردون .

یان فەرموویەتی : ﴿وَأَن تَصُومُوا خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ [البقـرة : ١٨٤] ، واتـە : بێگومـان ڕۆژوو گرتن چاکترە بۆتان ئەگەر بەو کارە بزانن .

هەروەها پێغەمبەر ﷺ لـە فەرموودەکانیـدا ئـەوەی بـۆ ڕون کردووینەتـەوە کـە : ڕۆژوو قەڵایـە بەرامبـەر ئارەزووەکـانی ، وە پارێزەریـشە لـە ئـاگری دۆزەخ ، و خـوای گـەورەش دەرگایـەکی لـە دەرگاکانی بەهەشتی تایبەت کـردووە بـە ڕۆژوانانـەوە ، و ڕۆژوو گـرتن نـەفس دەگرێتـەوە لـە تـاوان و ئەوانەی ئارەزووی دەکات ، تا ئەبێتە دەروونێکی ئارام و خۆگر ، هەروەها ئەو پاداشـتە زۆر چـاکانەی کە سەبارەت بە ڕۆژووانان هاتووە ، لە فەرموودە( **صحيح** ) ە کاندا بە ئاشکراترین شێوە ئامـاژەی بـۆ کراوە .

### ١- ڕۆژوو پارێزەرە :

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمان دەکات بەو کەسانەی کە ئارەزووی ژن هێنانیان لا بەهێزە و توانـای ژن هێنانیـان نیـە ، فـەرمانیان پـێ دەکـات بـە ڕۆژوو گـرتن و کردوویـەتی بـە سـەر کـوت کـەری ئـەو ئارەزووانە ، چونکە توانای ئەندامەکان کۆت دەکات لە ناردنیان و ئەندامـەکان ئـارام دەکـات و هـەموو هێزێك جڵەو دەکات لەسەر کەشی . ئەوەش سەلمێنراوە کە ڕۆژوو کاریگەریـەکی سـەر سـووڕ هێنـەری هەیە بۆ پاراستنی ئەندامەکانی لەش و هێزە دەرونیەکان .

لەبەر هەموو ئەمانە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی : " يا مشعرَ الشباب مَن استطاعَ منكم الباءَةَ [٥] فَلْيَتَزَوَّجْ ، فإنَّهُ أغضُّ لِلْبَصرِ ، وأحْصَنُ للفرجِ ومَنْ لم يَسْتَطِعْ ، فَعَلَيْهِ بالصَّومِ ، فإنَّه لَهُ وِجَاء " [٦] .

---

[٥] **الباءة :** بریتیە لە هەموو جۆەر تواناییەك بۆ ژن هێنان .

[٦] أخرجه البخاري : ( ٤ / ١٠٦ ) رقم : ( ١٩٠٥ ) ومسلم رقم : ( ١٤٠٠ ) عن ابن مسعود .

واتە : ئەی کۆمەڵی لاوان هەر یەکێك لە ئێوە توانای ژن هێنانی هەبوو با ژن بهێنێت ، چونکە زیاتر چاو دەپارێزێت لە بینینی ناڕەوا ، و پارێزەریشە لە کەوتنە داوێن پیسیەوە ، ئەوەش توانای ژن هێنانی نەبوو ، با پەنا بەرێتە بەر ڕۆژوو گرتن ، چونکە سەرکوت کەرەوەی ئارەزووەکانە .

## ئەی موسڵمانی بەڕێز :

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەشی ئاشکرا کردوە کە : " حَفَّتِ الجَنَّةُ بِالَمكارِهِ ، وَحَفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَوات " .

واتە : بەهەشت پەرژین کراوە بەو کردەوانی کە ئارەزووت لێ ی نیە ، کەچی دۆزەخ پەرژین کراوە بە ئارەزووەکان ، جا ئەگەر بۆت ئاشکرا بوو کە ڕۆژوو ئارەزووەکان سەرکوت دەکات و توندیەکانی دەشکێنێ ، هەر ئارەزووەکانیشە نزیکت دەکاتەوە لە ئاگری دۆزەخ ، ڕۆژووش ڕێگرە لەوەی کە ڕۆژوان بڕواتە ئاگری دۆزەخ ، بۆیە لە فەرموودەکان بە ڕاشکاوی دەبینین ئاماژە بەوە دەکرێت کە ڕۆژوو قەڵا و پارێزەرە لە ئاگری دۆزەخ موسوڵمان خۆی پێ ئەپارێزێت لەو ئاگرە .

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت : " مَا مِنْ عَبْدٍ يَصُومُ يَوْمَاً فِي سَبيلِ اللهِ إلا بَاعَدَ اللهُ بِذَلِكَ وَجْهَهُ عَن النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفاً " [٧].

واتە : هەر بەندەیەك لە بەندەکانی خوا ڕۆژێك بە ڕۆژوو بێت لە پێناوی خوای پەروەردگار ، ئیللا بە هۆیەوە خوای پەروەردگار ڕوومەتی لە ئاگری دۆزەخ ( ٧٠ ) حەفتا پایز ( واتە : ساڵ ) دوور دەخاتەوە .

یان دەفەرمووێت : " الصِّيامُ جُنَّةٌ يَسْتَجِنُ بِهَا العَبْدُ مِنَ النَّارِ " [٨] ، واتە : ڕۆژوو پارێزەرە بەندەی موسوڵمان خۆی پێ دەپارێزێت لە ئاگری دۆزەخ .

وە دەفەرمووێت : " مَنْ صَامَ يَوْمَاً فِي سَبيلِ اللهِ ، جَعَلَ اللهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّارِ خَنْدَقَاً كَمَا بَيْنَ السَّماءِ وَالأرضِ " [٩].

واتە : هەر کەسێك ڕۆژێك بە ڕۆژوو بێت لە پێناوی خوادا ، خوای پەروەردگار بەو کارەی دۆڵێك لە نێوان ئەو و ئاگردا درووست دەکات ، دووری نێوانیان وەکو دووری نێوان ئاسمان و زەوی دەبێت .

---

[٧] أخرجه البخاري : (٦ / ٣٥) رقم : (٢٨٤٠) ومسلم رقم : (١١٥٣) عن أبي سعيد الخدري ، واللفظ لمسلم ، وقوله : "**سبعين خريفاً**" : ، أي : مسيرة سبعين عاما . قاله الحافظ في (الفتح) : ( ٦ / ٤٨ ) .

[٨] أخرجه أحمد : (٢٩٦/٣) عن جابر ، وأحمد: (٢٢/٤) عن عثمان بن أبي العاص ، وهو حديث صحيح.

[٩] أخرجه الترمذي : ( ١٦٢٤ ) من حديث أبي أمامة ، وفي سنده لين ، الوليد بن جميل : صدوق يخطيء لكنه توبع ، فأخرجه الطبراني في ( الكبير ) : ( ٨ / ٢٦٠ ، ٢٧٤ ، ٢٨٠ ) من طريقين عن القاسم عن أبي أمامة ، وفي الباب عن أبي الدرداء : أخرجه الطبرانيي في ( الصغير ) : ( ١ / ٢٧٣ ) وفيه ضعف . والحديث صحيح .

هەندێ لە زانایان بۆچونیان وایە ئەم فەرموودانە کە باس کران دەربارەی چاکەی ڕۆژوو ، تایبەتن بە کاتی جیهاد و تێکۆشان لە پێناوی خوادا ، بەڵام ئەوەی ئاشکرایە ڕۆژوو ئەگەر تەنها لە پێناوی خوادا بێت و بەپێی ئەو ڕونکردنەوانە بێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی ئەوا لە پێناوی خوادایە با لەو کاتەشدا نەبێت .

## ٢ـ ڕۆژوو ڕۆژووان دەخاتە بەهەشتەوە :

ئەی بەندەی گوێ ڕایەڵ : خوای پەروەردگار کۆمەکیت کات بۆ گوێرایەڵی کردنی و پشتوانیشت بێت بە ڕەحمەتی خۆی : پاش ئەوەی کە زانیت ڕۆژوو ڕۆژوان دوور دەخاتەوە لە ئاگری دۆزەخ ، ئەوەش بزانە کە هەر ئەویشە لە خۆشیەکانی بەهەشت نزیکت دەکاتەوە ، لە ( **أبو أمامة** ) وە دەگێڕنەوە رضي الله عنه کە فەرموویەتی : ووتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کردەوەیەکم پیشاندە بە هۆیەوە بڕۆمە بەهەشتەوە ، ئەویش فەرمووی : " عَلَيْكَ بِالصَّوْمِ ، لا مِثْلَ لَهُ " [١٠].

واتە : بەڕۆژوو بە ، ڕۆژووش هاوشێوەی نیە .

## ٣ ـ پاداشتی ڕۆژووانان پاداشتێکی دیاری نەکراوە [١١] :

## ٤ ـ ڕۆژووان دوو خۆشی بۆ هەیە [١١] :

## ٥ ـ بۆنی دەمی ڕۆژووان لەلای خوا لە بۆنی میسك خۆشترە [١١] :

لە ( **أبو هريرة** ) وە رضي الله عنه دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :

" قالَ اللهُ : كُلُّ عَمَلِ ابنِ آدم لَهُ إلا الصَّيام [١٢] ، فَإِنَّهُ لي و أَنَا أَجْزي بِهِ ، والصِّيامُ جُنَّةٌ ، وإذا كَانَ يَوْمُ صَوْمِ أحَدِكُم ، فَلا يَرْفَثُ ، ولا يَصْخَبُ ، فإنْ سَابَّهُ أحدٌ أو قاتَلَهُ فَلْيَقُل : إنّي امرُؤٌ صائم [١٣] ،

---

[١٠] أخرجه النسائي : ( ٤ / ١٦٥ ) ، وابن حبان : ( ص : ٢٣٢ — موارد ) ، والحاكم : ( ١ / ٤٢١ ) ، وسنده صحيح .

[١١] بەڵگەی هەموو ئەو بڕگانەی کە ئەستێرەیان لە پاشدا دانراوە ئەم فەرموودەیەیە کە دوای خاڵەکان دێت .

[١٢] واتە پاداشتی دیاری کراوی هەیە جگە لە ڕۆژوو نەبێت پاداشتەکەی دیاری نەکراوە .

[١٣] ئەو کارەش بە ووتەیەکی بیستراو دەبیت بۆ ئەوەی جوێندەر و شەڕگێڕ واز لە کارەکەیان بیهێنن ، یان ووتراوە : ئەم ووتەیە لە دەرونی خۆیدا ئەیبێت بۆ ئەوەی ڕۆژووان دوور بخاتەوە لە جوێن و شەڕ کردن . ووتەی یەکەم ووتەی پەسەند و هەڵبژاردەیە و لە ووتەی دووەم ڕون ترە ، چونکە ووشەی ( ووتە ) ئەگەر پەتی ( **مطلق** ) بێ : ووتەی زمان نەبێ هیچی تر ناگرێتەوە . بەڵام ئەوەی لە دەرونداییە تایبەت کراوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەکدا کە ( **أبو هريرة** ) لێ وە دەگێڕێتەوە دەفەرمووێت : " إن الله تجاوز لامتي ما حدثت به أنفسها ما لم تتكلم به ، أو تعمل به " ( **متفق عليه** ) ، واتە : خوای پەروەردگار قەڵەمی تاوانی لەسەر ئومەتەکەم هەڵگرتووە لەو شتانەی کە لەدەرونی خۆیاندا دەیڵێنەوە ، ئەگەر بە ووتە نەیڵێن ( واتە : بە زمان دەری نەبڕن ) ، و کردەوەی پێ نەکەن . بەمەش ئەوە ئاشکرا دەبێت کە ووتەی پەتی ( **الكلام المطلق** ) تەنها بە ووتەی بیستراو دەوترێت کە لە شێوەی دەنگ و پیتدا بوتریت خوای پایە بەرزیش زاناترە .

والذي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِه لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللهِ مِنْ رِيحِ المِسْكِ [١٤] ، لِلصَّائِمِ فَرْحَتانِ يَفْرَحُهُما : إذا أَفطَرَ فَرِحَ ، وإذا لَقِيَ رَبَّهُ فَرِحَ بِصَومِه " [١٥].

واتە : خوای پەروەردگار فەرموویەتی : هەموو کردەوەی ئادەمیزاد بۆ خۆیەتی تەنها ڕۆژوو نەبێ بۆ منە ( واتە : هەمووی پاداشتێکی دیاری کراوی هەیە ڕۆژوو نەبێ پاداشتی دیاری نەکراوە ) ، ڕۆژووش پارێزەرە لە ئاگری دۆزەخ ، هەر یەکێ لە ئێمە بە ڕۆژوو بوو باواز لە ووتەی پڕو پوچ بێنێ و هاوار نەکات ، وە ئەگەر کەسێك جوێنی بە یەکێك لە ئێوەدا یان شەڕی پێ گێڕا با بڵێ : من بەڕۆژووم ، سوێند بیت بەو زاتەی کە نەفسی ( **محمد** ) ی بەدەستە : بۆنی دەمی ڕۆژووان لای خوا خۆشترە لە بۆنی میسك ، ڕۆژووان دوو خۆشی هەیە و دەستی دەکەوێت : ئەگەر ڕۆژوو بشکێنێ پێ خۆشحاڵ دەبێت ، وە ئەگەر چاوی بە خوای خۆی کەوت خۆشحاڵە بەڕۆژوو گرتنەکەی .

لە ڕیوایەتی ئیمامی ( **البخاري** ) دا " يَتْرُكُ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ وشَهْوَتَهُ مِنْ أَجْلي ، الصِّيامُ لي وأنَا أجْزي بِهِ ، والحَسَنَةُ بِعَشْرِ أمْثَالِها " .

واتە : ڕۆژووان واز لە خواردن و خواردنەوە و ئارەزووەکانی دێنێ ، ڕۆژوو گرتن بۆ منەو تەنها منیش پاداشتی دەدەمەوە ، ڕۆژوو پاداشتێکی دیاری نەکراوم بۆ دانراوە ، چاکەش بە دە ئەوەندەی خۆی پاداشت دەدرێتەوە .

بەڵام لە ڕیوایەتی ئیمامی (**مسلم** ) دا بەم شێوەیە هاتووە : " كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ يُضَاعَفُ ، الحَسَنَةُ بَعَشْرِ أمْثالِها ، إلى سَبْعِ مِئَة ضعف ، قالَ اللهُ تعالى : إلا الصَّوْم ، فإنَّهُ لي وأنا أجزي بِهِ ، يَدَعُ شَهْوَتَهُ وطَعَامَهُ مِنْ أَجْلي ، ولِلصَّائِمِ فَرْحَتانِ : فَرْحَةٌ عِنْدَ فِطْرِه ، وفَرْحَةٌ عِنْدَ لِقاءِ رَبِّهِ ، وَلَخَلُوفِ فَمِ الصَّائِمِ عِنْدَ اللهِ أطْيَبُ مِنْ رِيحِ المِسكِ " .

واتە : هەموو کردەوەیەکی نەوە و ڕۆڵەکانی ئادەم پاداشتەکەی چەندە جاری خۆی زیاد دەکرێت ، چاکەیەك بە دە جار ئەوەندەی خۆی تاوەکو ( ٧٠٠ ) حەوسەد جاری خۆی ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ... هتد

## ٦ ـ ڕۆژوو و قورئان شەفاعەت دەکەن بۆ خاوەنەکەیان :

---

[١٤] پێویستە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە زانای پێشەوا ( **ابن القيم الجوزية** ) نوسیەتی لەم بارەیەوە لە کتێبی ( **الوابل الصيب من الكلم الطيب** ) : ( ٣٢ – ٣٨ ) .

[١٥] أخرجه البخاري : ( ٤ / ٨٨ ) رقم : ( ١٩٠٤ ) ، ومسلم رقم : ( ١١٥١ ) واللفظ للبخاري .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " **الصِّيامُ والقُرآنُ يَشْفَعانِ للْعَبْدِ يَومَ القيامةِ ، يقولُ الصِّيامُ : أيْ رَبِّ مَنَعْتُهُ الطعامَ والشَّهوةَ فَشفَعْني فيهِ ، ويقولُ القرآنُ : مَنَعْتُهُ النَّومَ بالليلِ ، فَشَفِّعْني فيهِ ، قالَ : فَيُشَفَّعانِ** " [١٦] .

واتە : ڕۆژوو و قورئانی پیرۆز شەفاعەتە دەکەن بۆ خاوەنەکانیان لە ڕۆژی دوایدا ، ڕۆژوو دەڵێت : پەروەردگارم خواردن و ئارەزووەکانم لێ قەدەغە کردبوو لە دنیادا ، خوایە لەبەر من لێی خۆشبە ، قورئانیش دەڵێ : منیش شەوان خەوم لێ قەدەغە کرد بوو ، جا خوایە لەبەر من لێی خۆشبە ، پاشان فەرمووی : خوای پەروەردگار لەبەر ئەوان لێی خۆش دەبێت ، واتە : **هەردوو دەبن بەشەفاعەتکار بۆی** .

## ٧ ـ ڕۆژوو کەفارەتی هەندێ تاوانە :

لەو تایبەت مەندیانەی کە ڕۆژوو لە پەرستنەکانی تر جیا دەکاتەوە ، ئەوەیە کە خوای پەروەردگار کردوویەتی بە کەفارەت بۆ ئەو کەسانەی کە سەر ناتاشن لەکاتی حەج کردنیاندا بەهۆی نەخۆشیەك ، یان یان ئازارێك کە لەسەریاندا هەیە ، وە بۆ ئەو کەسانەی کە توانای قوربانیان نیە ، وە بۆ ئەو کەسانەی کە بەهەڵە خاوەن پەیمانێك دەکوژن ( **المعاهد** ) ، وە بۆ بەجێهێنانی سوێند ، وە بۆ کوشتنی نێچیر لە کاتی ئیحرام کردندا هێنانی سوینەخۆشیەك ، یان ئازارێك لەسەریان دا هەیە ، و بۆ ئەو کەسانەی کە توانای قوربانیان نیە یان بۆ ئەو کەسەی کە ئیحرامی حەجی پۆشیوە و ڕاو بکەن ، وە ئەو کەسانەی کە ( **ظهار** ) دەکەن . واتە : بەخێزانەکەی بڵێت : تۆ وەکو دایکم وایت ، **بەڵگەش لەسەر هەموو ئەو کردەوانەی ئەمانەن :**

**﴿ بەڵگە لەسەر ڕۆژوو گرتنی کەسێك سەرتاشین و قوربانی لە توانایدا نەبێت ❁ ﴾ :**

خوای بڵند و پایە بەرز فەرموویەتی : ﴿ وَأَتِمُّواْ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلّهِ فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ وَلاَ تَحْلِقُواْ رُؤُوسَكُمْ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضاً أَوْ بِهِ أَذًى مِّن رَّأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ

[١٦] أخرجه أحمد : ( ٦٦٢٦ ) ، والحاكم : ( ١ / ٥٥٤ ) ، وأبو نعيم : ( ٨ / ١٦١ ) من طرق عن حُيَي بن عبدالله ، عن عبد الرحمن الحُبُلى ، عن عبد الله بن عمرو ، وسنده حسن ، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) : ( ٣ / ١٨١ ) بعد أن زاد نسبته للطبراني في ( الكبير ) : ( ورجال الصحيح ) .

**سودێك :** لەم فەرموودەیەو هاوشێوەکانی ـ کە تیایدا باس لە کردەوکان دەکات لەسەر شێوەی بینراو و بەرجەستەدا ـ وەردەگیرێت ئەوەیە : کە پێویستە بڕوایەکی تەواومان هەبێت بەم فەرموودانە ، بەبێ گۆڕین ( **تحريف** ) و لێکدانەوەی هەڵە ( **تأويل** ) بۆیان ، ئەم کارەیش ڕێگاو ڕێبازی پیاو چاکانی پێشینە ( **طريقة السلف الصالح** ) ، بێگومان ئەم ڕێگایەش سەلامەت ترین و زانستی ترین و پتەوترین ڕێگەیە ( **أسلم وأعلم وأحكم** ) ، جگە لەوەیش کە یەکێکە لە مەرجەکانی ئیمان خوای پایەبەرز دەفەرمووێت : ﴿ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴾ [سورة البقرة : ٣] .

❁ تێبینی : ئەو ووتانەی کە لە نێوان دوو کەوانەی بەم شێوەیە ﴿ ﴾ دا دانراون و بە ( ❁ ) نیشانە کراون بۆ زیاتر ڕونکردنەوە لە لایەن وەرگێڕەوە زیاد کراون .

فَإِذَا أَمِنتُمْ فَمَن تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ذَلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴾ [البقرة : ١٩٦].

**﴿ بەڵگە لەسەر ڕۆژوو گرتنی کەسێك کە بە هەڵە پەیمان پێدراوێك بکوژێت ۞ ﴾ :**

خوای پایە بەرز فەرموویەتی : ﴿ وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ اللَّهِ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾ [النساء : ٩٢].

**﴿ بەڵگە لەسەر ڕۆژوو گرتنی کەسێك سوێندەکەی بەجێ نەهێنێت ۞ ﴾ :**

خوای بیسەر و زانا دەفەرمووێت : ﴿ لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ ذَلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ وَاحْفَظُوا أَيْمَانَكُمْ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ [المائدة : ٨٩].

**﴿ بەڵگە لەسەر ڕۆژوو گرتنی کەسێك لە ئیحرام دا ڕاو بکات ۞ ﴾ :**

خوای بە توانا و دانا دەفەرمووێت : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْتُلُوا الصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ وَمَن قَتَلَهُ مِنكُم مُّتَعَمِّدًا فَجَزَاءٌ مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ النَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ هَدْيًا بَالِغَ الْكَعْبَةِ أَوْ كَفَّارَةٌ طَعَامُ مَسَاكِينَ أَوْ عَدْلُ ذَلِكَ صِيَامًا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمْرِهِ عَفَا اللَّهُ عَمَّا سَلَفَ وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ اللَّهُ مِنْهُ وَاللَّهُ عَزِيزٌ ذُو انتِقَامٍ ﴾ [المائدة : ٩٥].

**﴿ بەڵگە لەسەر ڕۆژوو گرتنی کەسێك کرداری ( ظهار ) ـ ئەنجام دەدات ـ واتە بە خێزانەکەی بڵێت تۆ وەکو دایکم وایت یان هەر ووتەیەکی هاوشێوەی ئەم ووتەیە ـ ۞ ﴾ :**

خوای جوانکار و بەتوانا دەفەرمووێت : ﴿ وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن نِّسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا ذَلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ذَلِكَ لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ [المجادلة : ٣ ــ ٤].

هەروەها هاوبەشیش دەبێت لەگەڵ نوێژ و زەکاتدا بۆ کەفارەتی تاوانی ئەو فیتنانەی توشی پیاوان دەبن لە بواری دارای و کەس وکار و دراوسێ کانیەوە .

لە ( **حنيفة** ) كوڕی ( **اليمـان** ) ەوە رضي الله عنه دەگێڕنـەوە كـە فەرموويـەتی : پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموويەتی : " فِتْنَةُ الرَّجُلِ في أَهْلِهِ و مَالِهِ و جَارِهِ ، تُكَفِّرُها الصَّلاةُ والصِّيامُ والصَّدَقَةُ " [١٧].

## ٨ ـ دەگار ( الرَّيان ) تەنها بۆ ڕۆژووانانە :

لــە (**ســهل** ) ی كــوڕی ( **ســعد** ) ەوە رضي الله عنه دەگێڕنــەوە فەرموويــەتی : پێغەمبــەری خــوا ﷺ فەرموويــەتی : " إنَّ في الجَنَّة باباً يُقالُ لَهُ الرَّيان يَدْخُلُ مِنْهُ الصَّائِمُونَ يومَ القيامةِ ، لا يَدْخُلُ مِنْــهُ أحَــدٌ غَيْرَهُم ، فإذا دَخَلُوا أُغْلِقَ ، فَلَم يَدْخُلْ مِنهُ أَحَدٌ ، فإذا دَخَلَ آخرُهُم أُغْلِقَ ، وَمَنْ دَخَلَ شَرِبَ وَمَنْ شَرِبَ لم يَظْمَأ أَبَداً " [١٨].

واتە : بەیەكێك لە دەرگاكـانی بەهەشـت دەوترێـت ( **الرَّيـان** ) ، تـەنها ڕۆژووانـی لێـوە دەچـێتە ژوورەوە لە ڕۆژی دوایـدا ، هـیچ كەسـێك جگـە لـە ڕۆژووانـان لـەم دەرگایـەوە ناچـێتە ژوورەوە ، ئـەم دەرگایە دوای چونە ژوورەوەی ڕۆژووانان دادەخرێت ، ئیتر كەسی لێوە ناچێتە ژوورەوە ، یان : ئەگەر دوا كەسی ڕۆژووانان چووە بەهەشتەوە ئەوا ئـەم دەرگەیـە دادەخرێـت ، ئـەو كەسـەیش لـەم دەرگایـە بڕواتە ژوورەوە ئاوێك دەخواتەوە ، ئەوەش ئەو ئاوە بخواتەوە هەرگیز تیونوی نابێت .

## چاكەكانی مانگی ڕەمەزان :

ڕەمەزان مـانگی خێـر و بەرەكەتـە ، خـوای پـەروەردگار چـەندین چـاكە و فـەزڵی ئاشـكرای پـێ بەخشیوە ، ئەوەش ئەم شێوانەی خوارەوەیە :

### ١ ـ مانگی قورئانی پیرۆزە :

خوای بەتوانا و پایەبەرز قورئانە پیرۆزەكەی ناردۆتە خوارە وە بۆ ڕێنیشاندانی خـەڵكی ، وە بـۆ ئەوەی شیفاش بێت بـۆ بـڕواداران و ڕێنیـشاندەریش بێـت بـۆ ڕاسـترین كـار و ڕونكردنـەوەش بێـت بـۆ ڕاسترین كار و ڕێگـای سـەرفرازی ، ئـەم ناردنـەش لـە شـەوی قـەدر ( **ليلة القدر** ) دا بـوو ، لـە مـانگی ڕەمەزانی خێر و بەرەكەت ، خوای خاوەن عەرشی گەورە و پیرۆز دەفەرمووێ : ﴿ شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَىٰ وَالْفُرْقَانِ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾ [البقرة : ١٨٥].

---

[١٧] أخرجه البخاري : ( ٢ / ٧ ) رقم : ( ١٨٩٥ ) ومسلم رقم : ( ١٤٤ ) .

[١٨] أخرجه البخاري : ( ٤ / ٩٥ ) رقم : ( ١٨٩٦ ) ومسلم رقم : ( ١١٥٢ ) ، والزيادة الاخيرة لابن خزيمة في ( صحيحة ) رقم : ( ١٩٠٣ ) .

واتە : مانگی ڕەمەزان ئەو مانگەیە کە قورئانی پیرۆز تێدا هێنراوەتە خوارەوە ، بۆ ئەوەی ببێتە ڕێنیشاندەری خەڵکی ، و چەندەها ڕونکردنەوەی تێدایە بۆ ڕێنیشاندان ، و جیاکردنەوەی ڕەوایی و ناڕەوایی لە یەکتر ، جا ئەگەر هەریەکێك لە ئێوە ، ئەم مانگەی بەسەردا هات ، با بە ڕۆژوو بێت .

ئەوەش بزانە برای خۆم خوای پەروەردگار بەرەکەتی خۆیت بەسەردا برێژێت ، وەسف کردنی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز ( بەوەی کە قورئانی تێدا هێنراوەتە خوارەوە ) لە ڕستەی یەکەمدا و دەست پێ کردنی ڕستەی دوای ئەو بە پیتی ( فـ ) واتای هۆکار و سەبەب دەگەیەنێت : ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾ ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێت بەڕێگەی ئاماژە کردن بۆ هۆکارەکە کە هۆی هەڵبژاردنی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز بۆ ئەوەی کە موسوڵمانان تیایدا بە ڕۆژوو بن ئەوەیە کە قورئانی پیرۆزی تێدا هێنراوەتە خوارەوە .

## ٢ ـ کۆت کردنی شەیتانەکان و داخستنی دەرگاکانی دۆزەخ و کردنەوەی دەرگاکانی بەهەشت لەم مانگەدا :

لەم مانگە موبارەکەدا خراپە کەم دەبێتەوە لەسەر زەویدا : شەیتانەکان و ( **مارد** ) ە یاخی بووەکانی جنۆکە زنجیر و توند دەکرێن بە زنجیر و کۆت و پاوەند ، بەوەش توانای زیانیان نیە بە بەندەکانی خوا بەو شێوەیەی چۆن لەپێشدا زیانیان پێ دەگەیاندن ، ئەوەش بەهۆی خەریك بوونی موسوڵمانان بەڕۆژووەوە ، ئەو ڕۆژووەی کە هۆی سەرکوت کردنی ئارەزووەکانە ، وە بەهۆی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز و هەموو چەشنە پەرستەکانی تر کە هۆی پەروەردە و پاك بوونەوەی دەرونن ، خوای پایە بەرز دەفەرمووێت : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ [البقرة : ١٨٣].

واتە : ڕۆژووتان لەسەر فەرز کراوە هەروەکو چۆن لەسەر ئوممەتانی پێش ئێوە فەرز کراوە بۆ ئەوەی لە خوا بترسن و خۆتان بپارێزن لە سزای خوا .

بۆیە دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن و دەرگاکانی بەهەشتیش دەکرێنەوە ، چونکە لەم مانگەدا کاری چاکەو ووشەی شیرین زۆر دەبێت .

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت : " إِذَا جَاءَ رَمَضَانُ فُتِحَ أَبْوَابُ الجَنَّة [١٩] ، وغُلِقَت أبوابُ النِّيران ، وَصُفِدَتِ الشَّيطان " [٢٠].

---

[١٩] في رواية لـمُسلم : " فتحت أبواب الرحمة " .

[٢٠] أخرجه البخاري : (٤/٩٧) رقم : (١٨٩٨) و (١٨٩٩) و (٣٢٧٧) ، ومسلم رقم : ( ١٠٧٩ ) .

واتــە : کــە مــانگی ڕەمــەزان بەســەردا دێــت دەرگاکــانی بەهەشــت دەکرێنــەوە ، و دەرگاکــانی دۆزەخیش دادەخرێن ، و شەیتانەکان زنجیر دەکرێن .

هــەموو ئەوانــەش لــە شــەوی یەکــەمی ئــەم مانگــە پــیرۆزە دەبێــت ، چــونکە پێغەمبــەر ﷺ دەفـەرمووێت : " إِذَا كانَ أَوَّلُ لَيْلَةٍ مِنْ شَهْرِ رَمَضان ، صُفِّدَتِ الشَّيَّطان وَمَرَدَةُ الجِّنِ ، وَغُلِقَت أبــوابُ النَّارِ فَلَمْ يُفْتَح مِنْها بَابٌ ، وَفُتِحَت أبوابُ الجَنَّة فَلَمْ يُغْلَق مِنْهَا بَابٌ ، وَيُنَادي مُنادٍ يَا بَاغِيَ الخَيْرِ أَقْبِلْ وَيا بَاغِيَ الشَّرِ أَقْصِرْ ، وَللهِ عُتَقاءٌ مِن النَّارِ و ذلِكَ كُلَّ لَيْلَة " [٢١].

واتە : کە ڕۆژی یەکەم بەسەردا دێت لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆز ، شەیتانەکان و یاخی بوو (**مَرَدَة**) ە کـانی جنۆکـە زنجـیر دەکـرێن و دەرگاکـانی دۆزەخ دادەخـرێن و هـیچ دەرگایـەکی ناکرێتـەوە ، وە دەرگاکانی بەهەشتیش دەکرێنەوە و هیچ دەرگایەکیان داناخرێت ، وە بانگـەوازکارێك بـانگ دەکـات : ئەی ئەو کەسەی چاکەت دەوێت چاکە بکە ، وە ئەی ئـەو کەسـەی خراپـەت دەوێت واز بێنـە ، خـوای پەروەردگاریش هەموو شەوێك لەشەوەکانی ئەم مانگە پیرۆزە چەندەها کەس ڕزگار دەکـات لـە ئـاگری دۆزەخ .

## ٣ ـ بوونی شەوی قەدر ( ليلة القدر ) تیایدا:

ئەی بەندەی بڕوادار ئەوت زانی کە پەروەردگار مانگی ڕەمـەزانی هەڵبـژاردوە ، لەبـەر ئـەوە لـەم مانگەدا قورئانی پیرۆزی ناردوەتە خوارەوە ، دەتوانرێت ئەوە بەکار بهێنێت لـە " **قیـاس**" دا بەچـەند ڕێگەیەکی جۆراو جۆر ، **لەوانە :**

**أ** / پیرۆزترین ڕۆژ لای خوای پەروەردگار لەم مانگەدایـە کـە قورئـانی تێدا نێراوەتـە خـوارەوە ، بۆیە پێویستە تایبەتمەندیش بدرێت بەزیادکردنی کردەوەی چاك .

باشـترین بەڵگـەش بـەدوا گـــەڕانی شـەوی قـەدر ( **ليلـة القـدر** ) ە و تایبەتمەنـدێتی پێـدان بـە کردەوەی زیاتر لە لایەن پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵـەکانی ـ خـوای پـەروەردگار لـە هـەموویان ڕازی بێـت ـ باسی ئەمەش لەبەشەکانی تری ئەم کتێبەدا لە باسی ( **ليلة القدر** ) دا باس دەکرێت .

**ب** / موسوڵمانان هەر نیعمەتێکیان دەست کەوتبێت ، وا پێویست دەکات کردەوەی زۆر بکەن بـۆ شوکرانە بێژی ئەو نیعمەتەی کە پێیان بەخشراوە ، بەڵگەش ئەم ووتەیە ئەوەیە کە خوای پـەروەردگار دوای بەسـەربردنی مـانگی ڕەمـەزان فەرموویـەتی : ﴿ وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ [البقرة : ١٨٥] .

---

[٢١] أخرجه الترمذي رقم : ( ٦٨٢ ) ، و ابن خزيمة : ( ٣ / ١٨٨ ) من طريق أبي بكر بن عياش عن الاعمش عن أبي هريرة ، و هذا إسناد حسن .

واتە : بۆ ئەوەی ڕۆژەکانی ڕەمەزان تەواو بکەن و خوای خۆتان بە گەورە بزانن لەبەر ئەو ڕێنیشاندانەی کە کردوونی وە بۆ ئەوەی شوکرانە بژێری نیعمەتەکانی خوا بکەن .

وە خوای پایە بەرز دوای کۆتای هاتنی نیعمەتی حەج دەفەرمووێت : ﴿فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَاسِكَكُمْ فَاذْكُرُوا اللَّهَ كَذِكْرِكُمْ آبَاءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا﴾ [البقرة : ٢٠٠] .

واتە : ئەگەر هەموو کردەوەکانی حەجتان تەواو کرد زیکری خوا بکەن و خواتان لە یاد بێت چۆن باوکانتان لەیادە یان لەوەش زیاتر .

## واجب بوونی ڕۆژووی ڕەمەزان

### ١ / قۆناغی یەکەمی ڕۆژووگرتن : ﴿فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُ﴾ :

لەبەر ئەو هەموو چاکانەی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان کە لە پێشدا باسکران خوای پەروەردگار ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی لەسەر مەسەڵمانان پێویست کردوە ، بەڵام لەبەر ئەوەی بڕینەوەی مرۆڤ لە ئارەزووەکانی و ئەو شتانەی کە خوی پێوە گرتوون شتێکی زۆر قورس و گران بوو ، فەرز بوونەکەی بۆ ساڵی دووەمی کۆچی دواخرا ، پاشان کە دڵەکان لەسەر یەکخوا پەرستی و بەگەورە زانینی دروشمەکانی خوا جێگیر بوون ، گوێزرانەوە بۆ سەر ئەو کارەو دەست پێکردنەکەشی بە هەڵبژاردن و ویستی موسڵمانان بوو ، لەگەڵ هاندانی موسڵمانان بۆ ڕۆژووگرتنی - واتە : موسوڵمانان سەربەست ( **مُخَيَّر** ) بوون لە گرتن و نەگرتنی ڕۆژوو - چونکە لەسەرەتادا کارێکی قورس بوو لەسەر هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بۆیە هەر کەسێك بیویستایە بە ڕۆژوو نەبێت قەرەبووی دەکردەوە - واتە : فدیەی دەدا - خوای میهرەبان دەفەرمووێی : ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُ وَأَن تَصُومُوا خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾[البقرة : ١٨٤] .

واتە : ئەو کەسانەی کە توانای دانی فیدیەیان هەیە با فیدیە بدەن ، فیدیەشی ژەمێك خواردن پێ دانی هەژارێکە ، ئەوەی زیاتری پێ بکرێت ئەوا خێرتر و چاکترە بۆی ، بەڵام گەر بە ڕۆژوو بن چاکترە بۆتان ئەگەر بزانن .

### ٢ / قۆناغی دووەمی ڕۆژووگرتنی ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾ :

پاش ئایەتی قۆناغی یەکەم ئایەتی پاش خۆی هاتە خوارەوە و حوکمی ئایەتی یەکمی (**نەسخ**) کردەوە ، دوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کە (**عبد الله**) کوڕی ( **عمر** ) و ( **سلمة** ) کوڕی ( **الأکوع** ) ن

، ئەم هەواڵەمان پێدەگەیەنن و دەفەرموون : [٢٢] " نەسخ کراوەتەوە بە ئایەتی : ﴿ شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُواْ الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ اللّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ [البقرة : ١٨٥] ، ئەم ئایەتە پیرۆزە لە پێشدا تەفسیر کراوە ئەوەی نەبێ کە خوای پەروەردگار دەفەرمووێت : ﴿وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ . . . وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾ واتا کەشی ئەوەیە : ئەو کەسانەی کە نەخۆشن یان لەسەر سەفەر و گوزەردان ، دەتوانن بەڕۆژوو نەبن و پاشان بەژمارەی ئەو ڕۆژانە قەزای ڕۆژووەکەیان دەکەنەوە ، بەم کارەش خوای پەروەردگار کارەکەتان لەسەر سوك دەکاتەوە و نایەوێ کارتان لەسەر قورس بکات .

وە لە " **ابن أبي ليلى**" وە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی : " حَدَّثَنَا أَصَحابِ مُحَمَّد ﷺ نَزَلَ رَمَضان فَشَقَّ عَلَيْهِم ، فَكانَ مَنْ أَطْعَمَ كُلَّ يَوْمٍ مسكيناً تَرَكَ الصَّوْمَ مِمَّن يُطِيقُهُ ، وَرُخِصَ لَهُم في ذَلِكَ ، فَنَسَخَتْها : ﴿ وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ ، **فَأُمِرُوا بَالصَّوْم** " [٢٣] .

واتە : **هاوەڵانی** محمد ﷺ دەیان فەرموو : کە ئایەتی ڕۆژوو گرتنی ڕەمەزان هاتە خوارەوە ئەو کارەیان لەسەر قورس بوو ، ئەوەیان نانی یەك ژەمی هەژارێکی بدابایە بەرامبەر نەگرتنی ڕۆژووەکەی بەڕۆژوو نەدەبوو ، لەوانەی کە توانایان هەبوو ، واتە بەرامبەر بوون و بەڕۆژوو نەبوونیان خرابوە دەستی خۆیان ، بەڵام ئایەتی : ﴿وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ ئەم حوکمەی ( **نەسخ** ) کردەوە و فرمانی پێکردن بەڕۆژوو گرتن .

پاشان ڕۆژووی ڕەمەزان بوو بە پایەیەك لە پایەکانی ئیسلامی پیرۆز و بنەوایەك لە بنەواکانی ئایین ، بە بەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەری نێردراو بەڕەحمەت و مهرەبانێتی ﷺ کە دەفەرمووێ : " **بُنِيَ الإِسْلامُ عَلَى خَمْسٍ : شَهادَةِ أَنْ لا إِلهَ إِلا اللهُ ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ ، وإِقَامِ الصَّلاةِ ، وَإِيتَاءِ الزَّكاةِ ، وَحَجِّ الْبَيْتِ ، وَصَوْمِ رَمَضَان** " [٢٤] .

واتە : ئیسلام بنیات نراوە لەسەر پێنج پایە : شایەتی دان بەوەی کە هیچ خوایەك نییە لە بووندا شایستەی پەرستن بێ جگە لە ﷲ ، وە **محمد** یش ﷺ نێردراوی خوایە ، و تەنها هەر ئەوە

[٢٢] أخرجه حديث ابن عمر : البخاري : ( ٤ / ١٨٨ ) ، وحديث سلمة : البخاري : ( ٨ / ١٨١ ) ، ومسلم رقم : ( ١١٤٥ ) .
[٢٣] علّقه البخاري : (١٨١/٨ – فتح الباري) ، ووصله البيهقي في (سننه) : (٤ / ٢٠٠) ، وسنده صحيح ، وأخرجه بنحوه ـــ مطولا ـــ أبو داود رقـم : (٥٠٧) من طريق آخر ، وسنده حسن في الشواهد ، وأخرجه أبو نعيم في (المستخرج) ـــ كما في (تغليق التعيق) : (١٨٥/٣) ـــ من طريق ثالث بسند صحيح أيضا .
[٢٤] أخرجه البخاري : ( ١ / ٤٧ ) رقم : ( ٨ ) ، ومسلم رقم : ( ١٦ ) عن ابن عمر رضي الله عنه .

شایستەی شوێنکەوتنە ، لە گەڵ کردن نوێژ ، و زەکات دان ، و حەج کردن ، و ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز .

# هاندان بۆ گرتنی ڕۆژووی ڕەمەزان

## ١ ـ ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان هۆی لێخۆشبوونی گوناهەکانە :

خوای پەروەردگار بەدیاری کردنی چاکە و بەرزی پلەی ڕۆژوو : هانی موسوڵمانانی داوە بۆ گرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان ، لەو بارەیەوە هاتووە کە ئەگەر ڕۆژووان تاوانەکانی وەکو کەف سەر دەریا وابێ ئەوا خوای پەروەردگار و پایە بەرز بەهۆی ئەم پەرستنە موبارەکەوە لێی خۆش دەبێت .

(**أبو هريرة**) وە ﷺ دەگێڕنەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی : " مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا ، وَاحْتِسَابًا ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ " [٢٥].

واتە : هەرکەسێك ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێت ، بەمەرجێ بڕوای بەفەرزێتی ئەم کارە هەبێ و چاوەڕوانی پاداشتی ڕۆژی دوایی بێت ، ئەوا خوای میهرەبان لە هەموو ئەو گوناهانەی کە کردوویەتی خۆش دەبێت .

وەهەر لەوەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : " الصَّلَوَاتُ الخَمْسِ ، والجُمْعَةُ إِلَى الجُمَعَةِ ، وَرَمَضَانَ إِلَى رَمَضَانَ ، مُكَفِّرَاتٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ إِذَا اجْتُنِبَت الكَبَائِر " [٢٦].

واتە : پێنج فەرزەی نوێژ و نوێژی ( **جومعە** ) بۆ نوێژەکەی تر ، وە ڕۆژووی ڕەمەزان بۆ ڕەمەزانەکەی تر ، گوناهەکان دەسڕنەوە کە لە نێوانیاندا ئەنجام دەدرێت ، بەمەرجێ موسوڵمانان خۆی لەگوناهە گەورەکان ( **الكبائر** ) بپارێزێت .

وە هەر لە ( **أبو هريرة** ) وە ﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتە سەر مینبەر و فەرمووی : " آمین ، آمین ، آمین " ئەنجا پرسیاریان کرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ : تۆ کاتێ ڕۆیشتیتە سەر مینبەر

---

[٢٥] أخرجه البخاري : ( ٤ / ٩٩ ) رقم : ( ١٩٠١ ) ، ومسلم رقم : ( ٧٥٩ ) .

واتای : " إيمانا واحتسابا " : واتە : بڕوا بوون بە فەرزێتی ڕۆژووەکە ، وە حەز بوون لە پاداشتەکەی و لە دەرونیشدا ڕازی بێت بەو کارە و ڕۆژوو گرتنی پێ ناخۆش نەبێت و بە قورسیشی نەزانێت ، لەم بارەیشەوە ( أحمد شوقي ) کە نازناوی : ( أمير الشعراء ) یە دەڵێت :

رمضان ولى هاتها يا ساقي ... مشتاقة تسعى إلى مشتاق
ما كان أكثَرَهُ علي الامها ... وأقله في طاعة الخلاق

[٢٦] أخرجه مسلم رقم : ( ٢٣٣ ) .

فەرمووت : " آمين ، آمين ، آمين " ؟ فەرمووی : " إِنَّ جِبْرِيْل ـعليه السلام ـ أَتَانِي فَقَالَ : مَنْ أَدْرَكَ شَهْرَ رَمَضَان فَلَم يُغْفَر لَهُ فَدَخَلَ النَّار ، فَأَبْعَدَهُ اللهُ ، قُلْ : آمين ، فَقُلْتُ آمين ... " [٢٧] .

واتە : لەو کاتەدا ( **جبريل** ) سەلامی خوای لێ بێت ، هاتە لام و فەرمووی : هەر کەسێك لە ئومەتەکەت مانگی ڕەمەزانی بەسەر داهات و خوا لێی خۆش نەبوو ، با بڕواتە دۆزەخەوە و خوا دووری کاتەوە لە ڕەحمەتی خۆی ، بڵێ : (آمين ) ، دەفەرمووێت منیش ووتم : (آمين ) ... هتد فەرموودەکە .

## ٢ ـ وەڵامدانەوەی پاڕانەوەکان و ڕزگار بوون لە ئاگری دۆزەخ لە ڕەمەزاندا :

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت " إِنَّ للهِ فِي كُلِّ يَوْمٍ عُتَقاءٌ مِنَ النَّارِ ، فِي شَهْرِ رَمَضَان ، وَإِنَّ لِكُلِّ مُسْلِمٍ دَعْوَةٌ يَدْعُو بِهَا فَيُسْتَجَابُ لَهُ " [٢٨].

واتە : خوای پەروەردگار لە هەموو ڕۆژ و شەوێکی مانگی ڕەمەزاندا چەندەها کەس ڕزگار دەکات لە ئاگر ، هەروەها بۆ هەموو موسوڵمانێکیش پاڕانەوەیەك هەیە تێیدا بپاڕێتەوە وەڵامیش دەدرێتەوە.

## ٣ ـ گرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان یەکێکە لە سیفەتی ڕاستگۆیان و شەهیدان :

لە ( **عمر** ) ی کوڕی ( **مرة الجهني** ) وە رضي الله عنه دەگێڕنەوە فەرموویەتی : " پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر شایەتی ئەوە بدەم کە هیچ خوایەك نیە لە بووندا جگە لە الله ، و شایەتی ئەوەش بدەم کە تۆ پێغەمبەری خوایت ، و پێنج فەرزیش نوێژ ئەنجام بدەم ، و زەکاتیش بدەم ، لە گەڵ بە ڕۆژوو بونم لە مانگی ڕەمەزاندا و کردنی نوێژی ( **تەراویح** ) ، لە چ کۆمەڵێك دەبم ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : " مِن الصِّديقينَ وَالشُّهَدّاء " [٢٩] واتە : لە کۆمەڵی ڕاستگۆیان و شەهیدان دەبیت .

## ترساندن لە بەڕۆژوو نەبوونی هەندێك لە ڕەمەزان بە ئەنقەست :

---

[٢٧] أخرجه ابن خزيمة : ( ٣ / ١٩٢ ) ، و أحمد : ( ٢ / ٢٤٦ و ٢٥٤ ) ، و البيهقي : ( ٤ / ٢٠٤ ) من طُرُق عن أبي هريرة ، وهو حديث صحيح ، وأصله في ( صحيح مسلم ) رقم : ( ١٩٧٨ ) . وفي الباب : عن غير واحد من الصحابة ، انظرها في ( فضائل شهر رمضان ) ص : ( ٢٥ — ٣٤ ) لابن شاهين .

[٢٨] أخرجه البزار رقم : ( ٣١٤٢ ) ، و أحمد : ( ٢ / ٢٥٤ ) من طريق الأعمش ، عن أبي صالح عن جابر ، وأخرجه ابن ماجه رقم : ( ١٦٤٢ ) عنه مختصرا من طريق آخر ، وهو صحيح .

و (الدعوة المستجابة) **واتە : ئەو دوعا و پاڕانەوەش کە وەڵام دەدرێتەوە ، ئەو دوعایەیە کە لە کاتی ڕۆژوو شکاندن و بەر بانگدا دەکرێت** . وانظر ( مصباح الزجاجة ) رقم : ( ٦٠٤ ) للبوصيري .

[٢٩] أخرجه ابن حبان رقم : ( ١٩ ــ زوائده ) ، وسنده صحيح .

لـە (**أبـو أمامـة البـاهلي**) ەوە ﷺ دەگێڕنـەوە فەرموويـەتی : بيـستم پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەيفـەرموو : " بَيْنَمَا أَنَا نَائِمٌ أَتَانِي رَجُلانِ فَأَخَذَا بِضَبُعي[٣٠] فأتَيَا بِي جَبَلاً وَعْرَاً فقالا : إصْعَد ، فَقُلْتُ إنِّي لا أُطيقُهُ ، فقالا : سَنُسَهِلُهُ لَكَ ، فَصَعَدْتُ ، حتى إذا كُنْتُ في سَوادِ الجبلِ إذا بِأَصْوات شَديدة . قُلْـتُ : مَا هَذه الأصْواتُ ؟ قالوا : هَذا عُواءُ أهلِ النَّارِ ، ثُمَّ انطلقا بِي ، فإذا أَنا بِقَومٍ مُعَلَّقينَ بِعَرَاقِيبِهِم ، مُـشَقَّقَةٌ أَشْدَاقُهُم ، تَسيلُ أَشْدَاقُهُم دَمَاً ، قالَ : قُلْتُ : مَنْ هَؤُلاءِ ؟ قالَ : الذينَ يُفْطِرُونَ قَبْلَ تَحِلَّةِ صَـوْمِهِم[٣١] .... "[٣٢].

واتە : پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی : کاتێکيـان خـەوم لـێ کـەوتبوو ، دوو پيـاو هاتنـە لام و کرديان بە قوڵمدا ، تا بردميان بۆ لای شاخێکی سەخت ، پاشان پێ يان ووتم : سـەرکەوە ، ووتم : مـن توانای ئەوەم نيە ، ووتيان : بۆت ئاسان دەکەين ، منيش سەرکەوتم تا هەندێك ڕۆيشتينە سەرەوە لەو کاتەدا گوێم لە دەنگێکی توند بوو ، ووتم : ئەو دەنگە چيە ؟ ووتيان : هاوار و ناڵەی دۆزەخیيەکانە ، بەرەو سەرەوە برام ، لە ڕێگادا چاوم کەوتە سەر کۆمەڵە کەسانێك بە پشتە پێيانەوە هەڵواسـرابوون و لێوەکانيان شەقار شەقار کرابوو و خوێنی لێ دەهات ، دەفەرمووێ : پـێم ووتـن : ئـەو کەسـانە کـێن ؟ ووتيان ئەوانەن کە بەربانگ دەکەن پێش ئەوەی کاتی ڕۆژوويان تەواو بێت . واتە : پێش ڕۆژ ئـاوابوون ، ڕۆژوەکەيان دەشکێنن ... .

**تێبينی :** بەڵام ئەو فەرموودەيەی کە دەگێڕنەوە . گوايە . پێغەمبەر ﷺ فەرموويـەتی : " مَـنْ أَفْطَرَ يَوْمَاً مِنْ رَمَضَان مُتَعَمِّدَاً ، لا يُجْزِئُهُ صِيَامُ الدَّهْرِ وَإنْ صَامَهُ " .

ئەم فەرموودەيە فەرموودەيەکی ( **ضعيف** )ـە و ( **صحيح** ) نيە ، پاشان بە درێژی قسەی لەسـەر دەکەين -إن شاء الله- . واتاکەشی ئەوەيە ئەگەر کەسێك ڕۆژێك لە ڕەمەزان بە ڕۆژوو نـەبێت ئـەوا ئەگـەر بە درێژای ساڵ بە ڕۆژوو بێت بۆی حيساب ناکری .

## حوکمەکانی ڕۆژوو گرتن :

**ئەی موسوڵمان بەندەی خوا :** بزانـە . خـوای پـەروەردگار هـەموومان فێـری زانـست کـات ـ ئـەم پاداشتە زۆر گەورەيە و چاکە فراوانەی کە جگە لە خـوا پـەروەردگار و ميهرەبـان نـەبێ کـەس توانـای

[٣٠] مەبەست لە ( **ضبع** ) قۆڵ يان شان يان باڵە .

[٣١] واتە : پێش کاتی ڕۆژوو شکاندن .

[٣٢] أخرجه النسائي في : ( الكبرى ) ــ كما في ( تحفقة الأشراف ) : ( ٤ / ١٦٦ ) ، وابن حبان رقم (١٨٠٠ ــ زوائده ) ، والحاكم : ( ١ / ٤٣٠ ) من طرق عن عبد الرحمن بن زيد بن جابر ، عن سليم بن عامر ، عنه ، وسنده صحيح .

ژماردنی نیە ، و هیچ کەسیش دەستی ناکەوێت جگە لەو کەسە نەبێت کە ڕۆژووی ڕەمەزانکەی بەپێی سوننەتەکان و ڕێنمایەکانی دوا پێغەمبەری پێغەمبەران بێ ـعلیهم الصلاة وسلام ـ لەو حوکمانەی کە پەیوەستن بەم فەرزە گەورەیە و بەم مانگە موبارەکەوە .

ئێمەش لێرەدا دەست دەکەینە ڕوون کردنەوەی ، بە بێ ئەوەی لاسای ( **واتە : تەقلید** ) ی هیچ کەس بکەین لەم کارەماندا ، سەرچاوەشمان بۆ ئەم کارە بریتیە لە قورئانی پیرۆز و سوننەتە ( **صحیح** ) و ( **حسن** ) ەکانی پێغەمبەری خوایە ﷺ بە تێگەیشتنی سەلەفی سالحی ئەم ئومەتە ، لە چوار پێشەوایانمان و ئەوانەش پێش ئەوان بوون لە صەحابە و شوێنکەوتوانیان ، تەنها ئەمەش بەسە و پێویستت بەبەڵگەی تر نابێت . هەروەها باشترین مەزهەبی فیقهی و ڕاست ترین ئیجتهامان هەڵبژاردوو .

## ئەو کارانەی کە پێش ڕەمەزان ئەنجام دەدرێن :

## ١ ـ ژماردنی ڕۆژەکانی مانگی شەعبان :

پێویستە لەسەر ئوممەتی ئیسلامی ڕۆژەکانی مانگی شەعبان بژمێرن ، بە مەبستی خۆ ئامادەکردن بۆ مانگی ڕەمەزان ، چونکە مانگ بیست و نۆ ڕۆژ دەبێت و سی ڕۆژیش دەبێت ، بە بینینی مانگ ئوممەتی ئیسلامی هەموو بە ڕۆژوو دەبن ، بەڵام ئەگەر هەور بوو بە ڕێگر لە پێش بینینی مانگ ، ئەوا ئەو کاتە سی ڕۆژەی مانگی شەعبان تەواو دەکەین ، چونکە خوای پەروەردگار و بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویش مانگی کردووەتە هۆکارێك بۆ زانینی ژمارەی ڕۆژەکانی ساڵ ، مانگیش لە سی ڕۆژ زیاتر نابێت [٣٣] .

لە ( **أبو هريرة** ) وە رضي الله عنه دەگێڕنەوە فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " صُومُوا لِرُؤيَتِهِ ، وَأَفْطِرُوا لِرُؤيَتِهِ ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُم ، فَأَكْمِلُوا شَعبَانَ ثَلاثِينَ " [٣٤] .

واتە : بەڕۆژوو بن بە بینینی مانگی ڕەمەزان ، وە وازبێنن لە ڕۆژوو گرتن بە بینینی مانگی شەوال ، بەڵام ئەگەر هەور بەر مانگی لێ گرتن لەو کاتەدا سی ڕۆژەی مانگی شەعبان بژمێرن و پاشان بە ڕۆژوو بن .

---

[٣٣] مەبەستی نووسەران مانگەکانی ساڵی کۆچیە .

[٣٤] أخرجه البخاري ( ٤ / ١٠٦ ) رقم ( ١٩٠٩ ) ، و مسلم رقم : ( ١٠٨١ ) .

وە لە ( **عبد الله** ) ی کوڕی ( **عمر** ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " **لا تَصُومُوا حتى تَرَوا الهِلالَ ، ولا تُفْطِروا حتى تَرَوهُ ، فَإِنْ غُمَّ عَليكُم فَاقْدِروا لَهُ** " [٣٥].

واتە : بە ڕۆژوو نەبن تامانگی ڕەمەزان دەبینن وازیش مەهێنن تا مانگی شەوال نەبینن ، بەلاَم ئەگەر هەور بەر مانگی لێ گرتن لەو کاتەدا (**تەقدیری**) بۆ بکەن .

وە لە ( **عدي** ) ی کوڕی ( **حاتم** ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە فەرموویەتی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : " **إِذَا جَاءَ رَمَضَان فَصُومُوا ثلاثِينَ إِلا أنْ تَرَوا الهِلالَ قَبْلَ ذَلكَ** " [٣٦].

واتە : ئەگەر مانگی ڕەمەزان بەسەردا هات ئەوا سی ڕۆژ بەڕۆژوو بن ، جگە لەو مانگەی کە تەواو بوونی سی ڕۆژ مانگی شەوال دەبینن .

## ٢ ـ هەر کەسێك ڕۆژی گومان ( یوم الشك ) بەڕۆژوو بی ئەوا سەر پێچی لە فەرمانی پێغەمبەر کردووە ﷺ :

نابێ هیچ موسوڵمانێك ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ پێش مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو بێت ، بە بیانووی ئەوەی نەوەکو ڕۆژێك یان زیاتر لە مانگی ڕەمەزانی لەدەست بچێت ، جگە لەو کەسانەی کە ڕۆژوو گرتنی سوننەتیان لەگەڵ ئەو ڕۆژە جووت دەبێت .

لە ( **أبو هريرة** ) وە ﷺ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ : " **لا تُقَدِّمُوا رَمَضَان بِصَومِ يَومٍ ولا يَومَينِ ، إلا رَجُلاً يَصُومُ صَوماً فَلْيَصُمْهُ** " [٣٧].

واتە : پێش ڕەمەزان مەکەون بە ڕۆژێك ڕۆژوو گرتن ، هەروەها بە دوو ڕۆژیش جگە لەو کەسە نەبێ کە ڕۆژووی سونەتی دەکەوێتە ئەو ڕۆژانە ئەوا با ڕۆژووەکەی بگرێت .

برای موسوڵمان ئەوەش بزانە ئەو کەسەی ڕۆژی گومان ( **یوم الشك** ) بە ڕۆژوو بێ ئەوا سەرپێچی لە فرمانی پێغەمبەری خوای کردووە ﷺ .

لە ( **صلة** ) ی کوڕی ( **زفر** ) ەوە ، ئەویش لە ( **عمار** ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : " **مَن صَامَ اليومَ الذي يَشُكُّ فِيهِ ، فَقَد عَصَى أَبَا القاسم ﷺ** " [٣٨].

---

[٣٥] أخرجه البخاري ( ٤ / ١٠٢ ) رقم ( ١٩٠٦ ) ، و مسلم رقم : ( ١٠٨٠ ) .

[٣٦] أخرجه الطحاوي في (مشكل الاثار) رقم : (٥٠١) ، وأحمد : (٤ / ٣٧٧) ، والطبراني في (الكبير) : ( ١٧ / ١٧١ ) ، وفي سنده : مجالد بن سعيد ، وهو ضعيف كما قال الهيثمي في (مجمع الزوائد) : (٣/ ١٤٦) ، ولكن للحديث شواهد عدة انظرها في (الإرواء) رقم : (٩٠١) لشيخنا الألباني ــ رحمه الله ــ .

[٣٧] أخرجه البخاري رقم : ( ١٩١٤ ) و مسلم رقم : ( ٥٧٣ ــ مختصرة ) .

[٣٨] علقه البخاري : ( ٤ / ١١٩ ) ، و وصله أبو داود رقم : ( ٣٣٣٤ ) ، و الترمذي رقم : ( ٦٨٦ ) ، و ابن ماجه رقم : ( ٣٣٣٤ ) ، والنسائي رقم : ( ٢١٨٨ ) من عمر بن قيس الملائي ، عن أبي إسحاق عن صلة بن زفر ، عن عمار . و في سنده أبو إسحاق ــ وهو السبيعي ــ وهو مدلس وقد عنعنه ، وكان قد اختلط . ولكن له طرقا و شواهد أوردها الحافظ ابن حجر في ( تغليق التعليق ) : ( ٣ / ١٤١ ــ ١٤٣ ) يحسن الحديث بها .

واتە : هەر کەسێك بە ڕۆژوو بێت بە مەبەستی ڕەمەزان لەو ڕۆژەی کە گومانی لێ دەکرێت ، ئەوا سەرپێچی لە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ کردووە .

## ٣- ئەگەر یەك کەس مانگی بینی ئەوا با بەڕۆژوو بن بۆ ڕەمەزان هەروەها وازیش لە ڕۆژوو بێنن بۆ تەواو بوونی :

**مانگ بینین بە مانە جێگیر دەبێت :** بە شایەتی دانی دوو موسوڵمانی خاوەن عەدالەت ، لەبەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ : " صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ ، وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ ، وَأَنْسِكُوا لَهَا ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُم فَأَكْمِلُوا ثلاثينَ ، فَإِنْ شَهِدَ شَاهِدانِ فَصُومُوا وأَفْطِرُوا " [٣٩] ، بڕگەی کۆتایی فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت : کە ئەگەر دوو موسوڵمان شایەتی بینینی مانگیان دا ئەوا بە ڕۆژوو بن لە یەکەم ڕۆژی ڕەمەزان و وازیش بێنن لە ڕۆژوو لە کۆتایی مانگی ڕەمەزان بە بینینی دوو موسوڵمان .

بەڵام شاراوە نیيە تەنها بڕوا پێکردنی شایەتی دوو موسوڵمان لە ڕووداوێکدا ئەو ناگەیەنێت کە شایەتی موسوڵمانێك لەسەر بینینی مانگی ڕەمەزان وەرناگیرێت ، بەڵکو ئەوەمان پێ گەیشتووە لە ( **ابن عمر** ) ەوە رضي الله عنه کە فەرموویەتی : " تَرَاءى النَّاسُ الهِلالَ ، فَأَخْبَرْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَنِي رأيتُهُ ، فَصَامَ وأَمَرَ النَّاسَ بِصِيامِهِ " [٤٠].

واتە : خەڵکی هەوڵی بینینی مانگی ڕەمەزانیان دەدا ، منیش بە پێغەمبەرم ﷺ ڕاگەیاند کە من مانگم بینیوە ، پێغەمبەریش ﷺ بە بیستنی هەواڵەکە ڕۆژووی گرت و فەرمانی بە خەڵکی کرد بە ڕۆژوو بن .

## نیەتی ڕۆژوو :

### ١ ـ نیەتی ڕۆژووی فەرز دەبێ لەشەودا بهێنیت پێش دەرکەوتنی فەجر :

گەر سەلمێنرا کە مانگی ڕەمەزان دەستی پێ کردووە ، بەبینینی مانگ بەچاو ، یان بەشایەتی دان ، یان بە تەواو کردنی سی ڕۆژی مانگی شەعبان ، ئەو کاتە پێویستە لە سەر هەموو موسوڵمانێك

---

[٣٩] أخرجه النسائي : ( ٤ / ١٣٢ ) ، وأحمد : ( ٤ / ٣٢١ ) ، والدارقطني : ( ٢ / ١٦٧ ) من طريق حسين بن الحارث الجدلي عن عبد الرحمن بن زيد بن الخطاب عن أصحاب رسول الله ﷺ ، وسنده حسن ، وللفظ للنسائي ، وزاد أحمد : " **مسلمان** " ، والدارقطني : " **ذوا عدل** " .

[٤٠] أخرجه أبو داود رقم : ( ٢٣٤٢ ) ، و الدارمي : ( ٢ / ٤ ) ، وابن حبان رقم : ( ٨٧١ ) ، والحاكم : ( ١ / ٤٢٣ ) ، و البيهقي : ( ٤ / ٢١٢ ) من طريقين عن ابن وهب ، عن يحيي بن عبد الله بن سالم ، عن أبي بكر بن نافع ، عن أبيه ، عن ابن عمر . وسنده صحيح كما قال الحافظ ابن حجر في ( التلخيص الحبير ) : ( ٢ ١٨٧ ) .

هەر لە شەوەوە ( واتە : پێش دەرکەوتنی فەجر ) نیەتی ڕۆژووی هەبێ ، لە بەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرمووێ : " مَنْ لَم يُجْمِعِ الصِّيَامَ قَبْلَ الفَجْرِ فَلا صِيَامَ لَهُ " (٤١) .

واتە : ئەو کەسەی نیەتی ڕۆژووی نەبێت پێش دەرکەوتنی فەجر ئەوا ڕۆژوەکەی بەتاڵە .

وەدەفەرمووێ : " مَنْ لَمْ يُبَيِّت الصِّيَامَ مِن الليلِ فَلا صِيَامَ لَهُ " (٤٢) ، بەهەمان واتا .

**تێبینی :** نیەتیش جێگای دڵە و ووتنی بە زمان بیدعەیە و گومڕاییەیە هەرچەندە هەندێك لە خەڵكی بەچاکیشی بزانن .

بوونی نیەت پێش دەرکەوتنی فەجر تایبەتە بەڕۆژووی فەرزەوە ، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەهاتە لای دایکە ( **عائيشة** ) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لە ڕۆژانێك جگە لە ڕۆژانی ڕەمەزان و دەیفەرموو : " هَلْ عِنْدَكُم غَذَاءٌ ؟ وَإلا فَإنِّي صَائِم " (٤٣).

واتە : لە کاتی خواردنی بەیانیاندا پێغەمبەر ﷺ بە دایکە ( **عائيشة** ) ی دەفەرموو : خواردنتان لا هەیە ؟ ئەگەر نا ئەوا من بەڕۆژووم .

هەروەها سەلمێنراوە لە کردەوەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە وانەش : ( **أبي الدرداء** ) و ( **أبي طلحة** ) و ( **أبي هريرة** ) و ( **ابن عباس** ) و ( **حذيفة بن اليمان** ) ، ڕەزای خوا لە هەموویان بێ ، و خوای پەروەردگار لە گەڵ یاندا لە ژێر ئاڵای سەروەری کوڕانی ئادەم کۆمانکاتەوە (٤٤).

ئەمە لە ڕۆژووی سوننەتدایە و بەڵگەشە لە سەر ئەوەی کە بوونی نیەت پێش دەرکەوتنی فەجر تەنها لە ڕۆژووی فەرزدایە نەك لە ڕۆژووی سوننەتدا خوای پایە بەرزیش زاناترە.

## ٢ ـ داواکاریەکان بەستراون بە بوونی تواناوە :

ئەگەر کەسێك ڕەمەزانی بەسەردا هات و بێ ئاگا بوو لەوەی کە ڕەمەزانە و خواردن و خواردنەوەی خوارد ، پاشان بۆی دەرکەوت کە ڕەمەزانە با واز لە خواردن و خواردنەوە بێنێت و ڕۆژووەکەی تەواو بکات ، وە ئەگەر کەسێك خواردن و خواردنەوەی نەخواردبێت بەڵام نەیزانی بوو کەوا ڕەمەزانە کە هەواڵی پێگەیشت ڕەمەزانە ئیتر خواردن و خواردنەوە نا خوات و ڕۆژووەکەی بەسەر

(٤١) أخرجه أبو داود رقم : ( ٢٤٥٤ ) ، وابن خزيمة رقم : ( ١٩٣٣ ) ، والبيهقي : ( ٤ / ٢٠٢ ) من طريق ابن وهب ، عن ابن لهيعة ويحيى بن أيوب عن عبدالله بن أبي بكر بن حزم ، عن ابن شهاب ، عن سالم بن عبدالله عن أبيه ، عن حفصة . وفي لفظ عند الطحاوي في ( سرح معاني الأثار ) : ( ١ / ٥٤ ) : " **يبيت** " من الطريق نفسه . وأخرجه النسائي : ( ٤ / ١٩٦ ) ، والترمذي رقم : ( ٧٣٠ ) من طريق آخر عن يحيى به ، وسنده صحيح .

(٤٢) أخرجه النسائي : (٤ / ١٩٦) ، والبيهقي : (٤ / ٢٠٢) ، وابن حزم : (٦ / ١٦٢) من طريق عبد الرزاق عن ابن جريج عن ابن شهاب به ، وسنده صحيح ، لولا عنعنة ابن جريح ، ولكنه صحيح بما قلبه .

(٤٣) أخرجه المسلم رقم : ( ١١٥٤ ) .

(٤٤) انظرها وتخريجها في ( تغليق التعليق ) : ( ٣ / ١٤٤ ــ ١٤٧ ) .

دەبات لەم جۆرە کەسانەدا بوونی نیەت پێش دەرکەوتنی فەجر مەرج نیيە ، چونکە نەیان توانیوە بزانن ڕۆژووە یان نە ، وە یەکێك لە بنچینەکانی ئاینی ئیسلامیش ئەوەیە کە داواکاریەکان بەستراون بە بوونی تواناوە .

لە ( **عائيشة** ) وە ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : " كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَمَــرَ بِصيَامِ يَوْمِ عَاشُورَاء ، فَلَمَّا فُرِضَ رَمَضَان ، كَانَ مَنْ شَاءَ صَامَ وَمَنْ شَاءَ أَفْطَرَ " [٤٥] .

واتە : پێغمبەر ﷺ فەرمانی گرتنی ڕۆژووی ( **عاشورا** ) ی پێ کردبووین ، بەڵام کە ڕۆژووی ڕەمەزان فەرز کرا : ئەو کاتە هەر کەسێ بیویستایە ( **عاشورا** ) بە ڕۆژوو دەبوو یان بە ڕۆژوو نەدەبوو .

وە لە ( **سلمة** ) کوڕی ( **الأكوع** ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : " أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلاً مِــنْ أَسْلَم أَنْ أَذِّنْ فِي النَّاسِ : أَنَّ مَنْ أَكَلَ فَلْيَصُم بَقيَّةَ يَوْمِهِ ، وَمَنْ لَم يَكُنْ أَكَلَ فَلْيَصُم ، فِإنَّ اليَّومَ عَاشُوراء " [٤٦] .

واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە پیاوێك لە هۆزی ( **أسلم** ) کە بانگەواز بکات لە ناو خەڵکدا : هەر کەسێك خواردنی نەخواردووە با ئەو بەشەی لە ڕۆژ کە ماوە بە ڕۆژوو بێ ، وە ئەوەش کە خواردنی نەخواردووە با بەڕۆژوو بێت ، چونکە ئەوڕۆ ڕۆژی ( **عاشورا** ) یە .

ڕۆژوو گرتنی ڕۆژی ( **عاشورا** ) فەرز بوو ، پاشان ( **نەسخ** ) کرایەوە ، موسوڵمانانیش فەرمانیان پێ کرابوو لەو ڕۆژەدا واز لە خواردن بێنن ، کارەکەشیان بەو شێوەیە تەواو و بێ کەم و کوڕی بوو ، ڕەمەزانیش فەرزە ، حوکمی فەرزیش ناگۆڕێت .

## ٣ ـ هەندێك لە زانایان بۆچوونی پێچەوانەیان لە گەڵ ئەم بۆچوونەدا هەیە و دەڵێن : ( بەڵکو ئەبێ قەزای ڕۆژووەکەی بکاتەوە ) :

وە دەڵێن : ( **عاشورا فەرز نەبووە** ) ، بەڵام ئەوە بزانە "برای باوەڕدار " کە هەموو بەڵگەکان ئەوە دەردەخەن کە ڕۆژووی ( **عاشورا** ) فەرز بووە ، چونکە فەرمانی پێکراوە ، هەر وەکو لە فەرموودەکەی ( **عائيشة** ) دا هاتووە ، پاشان فەرمانەکە زیاتر جێگیر دەبێت چونکە بانگەوازی گشتی بۆکراوە ، وە لەوەش زیاتر ئەوەیە فەرمان بەو کەسانە کراوە کە خواردنیان خواردووە ، واز لە خواردن بهێنن ، هەر وەکو لە فەرموودەکەی ( **سلمة** ) کوڕی ( **الأكوع** ) دا هاتووە ، کە لە پێش تر باسمان لێوە کرد .

---

[٤٥] أخرجه البخاري : ( ٤ / ٢١٢ ) ، ومسلم رقم : ( ١١٢٥ ) .

[٤٦] أخرجه البخاري : ( ٤ / ٢١٦ ) ، ومسلم رقم : ( ١١٣٥ ) .

وە لە ( **محمد** ) کوڕی ( **صيفي الأنصاری** ) ەوە ﷺ دەگێڕنـەوە فەرموویـەتی" خَـرَجَ عَلَيْنَـا رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي يَوْمِ عَاشُوراء ، فَقَالَ : أَصُمْتُم يَومكُم هَذا ؟ قالَ بَعْضُهُم : نَعَم ، وقَالَ بَعْضُهُم : لا . قَال : فَأتمُّوا بَقِيَةَ يَومِكُم هَذا ، وَأَمَرَهُم أَنْ يُؤذنوا أَهْلَ العَرُوضِ ــ قُرَى المَدِيْنَةِ ــ أَنْ يُتِمُّوا بَقِيَةَ يَـوْمِهِم هَذا " [٤٧] .

واتە : لە ڕۆژی (**عاشورا**) دا پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لامان و پێی فەرمووین : ئەمڕۆ ڕۆژووتـان گرتووە ؟ هەندێکیان فەرموویان : بەڵێ ، وە هەندێکی تریان فەرموویان : نەخێر ، پاشان فەرمووی : کەواتە ئەوەندەی کەماوە لە ڕۆژ بەڕۆژوو بن ، وە فەرمانیشی پێکردین کە خەڵکی (**العروض**) ــ واتە : دێکانی شاری مەدینە ـ ئاگادار بکەینەوە : ئەوەندەی لە ڕۆژ ماوە بە ڕۆژوو بن ، ئەم لێکدانەوەش (**التقارب**) دەبڕینەوە بەو ووتەیەی (**ابن مسعود**) ﷺ کە دەفەرمووێت : " لَمَّا فُرِضَ رَمَـضَانُ تُـرِكَ عَاشُورَاءُ " [٤٨] ، واتە : کە ڕەمەزان فەرز بوو (**عاشورا**) تەرك کرا . وە بە ووتـەی (**عائشة**) ــ ڕەزای خوای لێبێت ـ کە دەفەرمووێت : " فَلَمَّا فُرِضَ رَمَضَان ، فَكَانَ رَمَضَانُ هُو الفَرِيْضَةُ ، وَتُرِكَ عَاشُورَاءُ " [٤٩] ، واتە : کە ئایەتی فەرز بوونی ڕۆژووی ڕەمەزان هاتە خوارەوە ، ڕەمەزان بوو بە ڕۆژووی فەرز و (**عاشورا**) تەرك کرا .

لە گەڵ ئەوەشدا ڕۆژوو گرتن لە ڕۆژی (**عاشورا**) دا بەیەك جاری تەرك نەکراوە ، بەڵکو یەك دەنگ بوونی زانایان ـ واتە : الاحماع ـ لەسەر ئەوەیە کە سوننەتە ، هەر وەکو : ئیمامی (**الحافظ ابن حجر**) لە کتێبی (**فتح الباري شرح صحيح البخاري**) دا : (٤ / ٢٤٦) لە ئیمامی (**ابن عبد البر**) ەوە دەگێڕێتەوە . ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ڕۆژوو گرتنەکەی هەر ماوە بەڵام ئەوەی کە وازی لێهێنرا ( **واجب ـ فەرز** ) بوونەکەیەتی ، خواش زانا ترە.

**کۆمەڵێکی تر دەڵێن :** ئەگەر فەرزیش بوو بێت ( **نەسخ** ) بووەتەوە و حوکمەکانی لەگەڵدا ( **نەسخ** ) بووەتەوە .

لە ڕاستیدا فەرموودەکانی ( **عاشورا** ) بەڵگەن لەسەر هەندێ شت :

١ ـ واجب بوونی ڕۆژووی ( **عاشورا** ) .

---

[٤٧] أخرجه ابن خزيمة : ( ٣ / ٣٨٩ ) ، وأحمد : ( ٤ / ٣٨٨ ) ، والنسائي : ( ٤ / ١٩٢ ) ، وابن ماجه : ( ١ / ٥٥٢ ) ، و الطبراني في ( الكـبير ) : ( ١٨ / ٢٣٨ ) من طريق الشعبي عنه ، وسنده صحيح .

[٤٨] أخرجه مسلم رقم : ( ١١٢٧ ) .

[٤٩] أخرجه مسلم رقم : ( ١١٢٥ ) .

٢ ـ ئەو کەسەی پێش دەرکەوتنی فەجر نیەتی ڕۆژووی فەرز نەبێ بەنەزانینەوە ڕۆژوەکەی تەواوە و بەتاڵ نابێتەوە .

٣ ـ ئەو کەسەی خواردن دەخوا و شت دەخواتەوە پاشان دەزانێت ، ئەو بەشەی تری ڕۆژوەکە بە ڕۆژوو دەبێت و قەزای لەسەر نیە .

خاڵی یەکەم لەم خاڵانە (**نەسخ**) بووەتەوە و بووەتە سوننەت ، هەر وەکو لە پێشدا باسمان لێوە کرد ، ئەمەش ئەوە پێویست ناکات بەهۆی (**نەسخ**) بوونی (**واجب**) ێتی حوکمەکانی تری (**نەسخ**) بکرێتەوە ، خواش زانا ترە .

بەڵگەی ئەم کۆمەڵەش ئەو فەرموودەیەیە مە ئیمامی (**أبو داود**) : (٢٤٤٧) و ئیمامی (**أحمد**) : (٤٠٩/٥) لە ڕێگەی (**قتادة**) لە (**عبد الرحمن**) ی کوڕی (**سلمة**) لە مامەیەوە دەگێڕنەوە : " أنَّ أسْلَمَ أَتَت النَّبيَّ ﷺ فَقَالَ : صُمْتُم يَوْمَكُم هَذا ؟ قَالُوا : لا ، قَالَ : فَأَتِمُّوا بَقِيَّةَ يَوْمِكُم هَذا وَاقضُوا " ، واتە : ئەو بەشەی ماوە لە ڕۆژەکەتان بە ڕۆژوو بن و پاشان قەزای بکەنەوە .

بەڵام ئەم فەرموودەیە ( **ضعيف** ) ە لە دوو هۆکار :

یەکەم : بەهۆی (**جهالة**)ی (**عبد الرحمن**)ی کوڕی (**سلمة**) ەوە ، ئیمامی (**الذهبي**) لە کتێبی (**الميزان**) دا : ( ٢ / ٥٦٧ ) دەفەرمووێ : (**لا يُعرف**) . واتە : نە ناسراوە ، وە ئیمامی (**الحافض**) لە کتێبی (**التهذيب**) دا : ( ٦ / ٢٣٩ ) فەرموویەتی : (حاله مجهـــول) ، وە ئیمامی (**ابن ابي حاتم**) لە کتێبی (**الجرح و التعديل**) دا : ( ٥ / ٢٨٨ ) ناوی هێناوەو هیچ (**جرح**) و (**تعديل**) ێکی لەسەر باس نەکردووە .

دووەم : ( **عنعن** ) ە کردنی لە لایەن ( **قتادة** ) ی ( **مدلس** ) ەوە .

## کاتی ڕۆژوو :

لـە پێشدا هـاوەڵانی پێغەمبـەرمان **محمـد** ﷺ ئەگـەر یـەکێکیان بـە ڕۆژوو ببوایـەن و کـاتی ڕۆژوو شکاندنیان بهاتبایە خواردن و خواردنەوەیان دەخوارد و لە گەڵ خێزانەکانیاندا جووت دەبوون پـێش ئـەوەی بخەون ، بەڵام ئەگەر هەر یەکێکیان خەوی لێ بکەوتبایە پێش نان خواردنی ئێواران هیچ لەوانـەی بـۆ حـەڵاڵ نەبوو ئەنجامی بدات لە خواردن و خواردنەوەو جووت بوون لەگـەڵ خێزانـەکانیان تـا ڕۆژەکـەی تـر ، پاشـان خوای بە توانا و بەخشندە ڕەحمەتی خۆی بەسەردا ڕشتن .

بەوەی کە مۆڵەتی ئەوەی دان ئەو کارانە ئەنجام بدەن تا پێش دەرکەوتنی فەجر ، ئەوانیش ئەو شتەیان پێ خۆش بوو ، ڕوون کەرەوەی ئەم ڕووداوە ئەم فەرموودەیەیە : لە (البراء) ی کوڕی (عازب) ەوە ﵁ دەگێڕنـەوە فەرموویـەتی : " كَانَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ إِذَا كَانَ الرَّجُلُ صَائِمَاً ، فَحَضَرَ الإفطَار ، فَقَالَ قَبْلَ أَنْ يُفْطِرَ ، لم يَأْكُل لَيْلَته ولا يَوْمه حَتى يُمْسي ، وإِنَّ قيسَ بن صَيْرَمَة الأنْصاري كَانَ صَـائِمَاً ، فَلمَّا حَضَرَ الإِفْطَارُ أَتَى امرَأته فَقَالَ لها : أعنْدَكَ طَعَامٌ ؟ قَالَتْ : لا ، ولكن أَنطَلِقُ فَأَطْلُبُ لَكَ ، وَكَانَ يَوْمُهُ يَعْمَل ، فَغَلَبَتْهُ عَيْنَاهُ ، فَجاءَت امرأتُهُ ، فَلَمَّا رَأَتْهُ قَالَتْ : خَيْبَةٌ لَكَ [٥٠] ، فَلَمَّا انْتصَفَ النَّهارُ غُشيَ عَلَيْه ، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ ، فَنَزَلَتْ هَذه الآية : ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ ﴾ ، فَفَرِحُوا بِذَلِكَ فَرَحَاً شَدِيْدَاً ، وَنَزَلَتْ : ﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ﴾ [٥١].

واتە : هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر یەکێکیان بە ڕۆژوو ببوایە و کـاتی شـکاندنی بهاتایـە و ئـەو کاتە بڕۆشتبایە بێ ئەوەی نان بخوات ئەوا ئەو شـەوە و ڕۆژیـش تـا ئێـوارە بەسـەر دەهـات هیـچی نـە دەخوارد . جارێکیان کە ( **قیس** ) ی کوڕی ( **صیرمة** ) ەی ئەنصاری بە ڕۆژوو دەبێت و کە کاتی ڕۆژوو شکاندن دێت ، دێتە لای خێزانەکەی و پێی دەفەرمووێ : هیچ خواردنێکت لا هەیە ؟ ئەویش فـەرمووی : نەخێر ، بەڵام ئەڕۆم بۆت داوا دەکەم ، کـە چـی ( **قـەیس** ) لەبـەر هـیلاك بـوونی لـە کـاری ڕۆژانـەی خەوی لێ کـەوت ، کەخێزانەکـەی گەڕایـەوە و بینـی خـەوی لێ کـەوتووە فـەرمووی : بـە ئـاواتی خـۆت نەگەیشتی ، بەو هۆیەوە لە کاتی نیوەڕۆدا بورایەوە ، ئەوە لە لای پێغەمبەر ﷺ باس کرا لە ئەنجامـدا ئەم ئایەتە دابەزی : ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ ﴾ ، واتە : بۆتان هەیەو ڕەوایە لەمەو دوا لە شەوانی ڕۆژوو گرتندا ( تا کاتی دەرکـەوتنی فـەجر ) لەگـەڵ خێزانـەکانتان جـووت بـبن . هـاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بەم شتە زۆر خۆشحاڵ بوون ، پاشـان ئـەم ئایەتـە دابـەزی : ﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ

[٥٠] ئەم ووشەیە کاتێك ئەوترێت : کەسێك بە دەواکاری یان بە مەرامی خۆی نەگات .
[٥١] أخرجه البخاري : ( ٤ / ٩١١ ) رقم : ( ١٩١٥ ) .

﴿لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ﴾ ، واتە : بخۆن و بخۆنەوە تا سپیایی ڕۆژتان بۆ لە تاریکی شەو ڕوون دەبێتەوە . ئەم سۆزە خواوەندیەی کە خوای بەسۆز و خاوەن میهرەبانی ڕشتوویەتی بەسەر بەندە بێ فیز و گوێڕایەڵەکانیدا ، ئەو بەندانەی کە فەرموویان : ﴿سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾ کاتی ڕۆژووی ڕۆژووان دیاری دەکات : دەست پێ کردن و کۆتای هاتنی ، ئەوەش لە دەرکەوتنی فەجرەوە تا پشت هەڵکردنی ڕۆژ و سەر هەڵدان و دەست پێ کردنی شەو ، وە بە نەمانی بازنەی خۆر لە ئاسۆدا .

## ١- واتای ( الخيط الابيض ) و ( الخيط الاسود ) :

کاتێ ئەو ئایەتە دابەزی کە لە پێشدا باسمان لێ وە کرد ، هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دوو پەتی ❋ ڕەش و سپی یان دەهێنا و دەیانخستە ژێر سەرینەکانیانەوە و سەیریان دەکرد بۆ ئەوەی بزانن لە یەکتر یان جیا دەکەنەوە ؟ یان دەیانخستە قاچیان و دەستیان دەکردە خواردن و خواردنەوە تا ئەو کاتەی بینینیان ئاشکرا دەبوو ، وە لە یەکتر جیا دەکرانەوە .

لە ( **عدي** ) کوڕی ( **حاتم** ) ەوە رضي الله عنه دەگێڕنەوە فەرموویەتی : " لَمَّا نَزَلَتْ : ﴿حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ﴾ عَمَدْتُ إِلى عِقَالٍ أَسْوَد وإِلى عِقَالٍ أَبْيَض فَجعَلْتُهُمَا تَحْتَ وِسَادَتِي ، فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ في الليلِ فَلا يَتَبيَّنُ لي ، فَغَدَوتُ عَلَي رَسُولِ الله ﷺ فَذَكَرتُ لَهُ ذَلِكَ ، فَقَالَ : إِنَّمَا ذَلِكَ سَوادُ الليلِ وبَيَاضُ النَّهارِ " (٥٢).

واتە : کە ئایەتی : ﴿حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ﴾ دابەزێنرا دوو پەتی ڕەش و سپیم هێناو لە ژێر سەرینەکەمدا دامنان ، پاشان سەیری ئەو دوو پەتەم دەکرد و بۆم ڕوون دەبوو بەشێوەیەك لە یەکیان جیا بکەمەوە ، پاشان ڕۆیشتمە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەو باسەم بۆی کرد ، ئەویش فەرمووی : " مەبەستی ئایەتەکە بریتی یە لە تاریکی شەو و ڕوناکی ڕۆژ " .

وە لە (**سهل**) ی کوڕی (**سعد**) ەوە رضي الله عنه دەگێڕنەوە فەرموویەتی : " لَمَّا نَزَلَتْ هَـذِه الآيَـة : ﴿وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ﴾ قَالَ : فَكَانَ الرَّجُلُ إذَا أَرَادَ الصَّومَ رَبَطَ أَحَدَهُم في رِجْلِه الخَيْطَ الأَبْيَضَ ، والخَيْطَ الأَسْوَدَ ، فَلا يَزالُ يَأكُلُ وَيَشْرَبُ حتى يَتَبَيَّن لَهُ رُؤيَتُهُمَا ، فَأَنْزَلَ اللهُ بَعْدَ ذَلِكَ : ﴿مِنَ الْفَجْرِ﴾ فَعَلِمُوا إِنَّمَا يَعْنِي بِذَلِكَ الليل والنَّهار"(٥٣).

---

❋ ووشەی ( پەت ) لە هەندێ ناوچەی کوردستان دا پێی دەوترێت : ( بەن ) . وەرگێڕ .

(٥٢) أخرجه البخاري : ( ٤ / ١١٣ ) رقم : ( ١٩١٦ ) و مسلم رقم : ( ١٠٩٠ ) .

(٥٣) أخرجه البخاري : ( ٤ / ١١٤ ) رقم : ( ١٩١٧ ) ، ومسلم : ( ١٠٩١ ) .

واتە : کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی : ﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ﴾ هەندێك لە پیاوانی دەور و بەری پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بیویستایە بەڕۆژوو بێت دوو پەتی سپی و ڕەشی دەبەستە هەردوو قاچیەوە و بەردەوام دەبوو لە خواردن و خواردنەوە تا ئاشکرا دەبوون ، پاشان خوای پەروەردگار ئایەتی : ﴿ مِنَ الْفَجْرِ ﴾ ی دابەزاندە خوارەوە ، پاش ئەوە زانیان مەبەستی لە ووشەی ( **الخيط الأبيض** ) ، و ( **الخيط الأسود** ) سپیایی ڕۆژو و تاریکی شەوە .

پاش ئەم ڕوون کردنەوە قورئانیە ، و بەرەکەتە بێ پایانەی خوای پەروەردگار ، دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ بەشێوەیەك ، کە هیچ جێگای گومان نەبێ ، ئەو کارەی بۆ هاوەڵانی ڕوون کردووەتەوە و باسی بۆ کردوون ، وە ڕەحمەتی خوا لە شاعیر بێ کە فەرموویەتی :

وَلَيْسَ يَصُحُّ فِي الأَذْهَانِ شَيءٌ　　　إذا احتَـــاجَ النَّهارُ إلَى دَلِيل

## ٢ ـ فەجر دوو جۆرە :

یەکێك لەو حوکمانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە باشترین شێوە بۆ هاوەڵانی ڕوونی کردووتەوە ئەوەیە : فەجر دوو جۆرە .

### یەکەم : فەجری درۆزن یان درۆزنە فەجر ( الفجر الكاذب ) :

دەرکەوتنی ئەم جۆرە یان کردنی نوێژی بەیانی حەڵاڵ ناکات ( واتە : دروست نییە نوێژی فەرزی بەیانیان لە کاتی دەرکەوتنی دا بکرێ ، بەڵکو دەبێ دوا بخرێت تا دەرکەوتنی جۆری دووەمی فەجر ) ، وە خواردنیش لەسەر ڕۆژوان حەرام و قەدەغە ناکات ( واتە : ئەو کەسەی کە نیەتی ڕۆژووی هەیە بۆی ڕەوایە خواردن و خواردنەوە بخوات و بخواتەوە با ئەم فەجرەش دەرکەوتبێ تاوەکو جۆری دووەمی فەجر دەردەکەوێ ئەو کاتە خۆی دەگرێتەوە لە خواردن و خواردنەوە ) .

### دووەم : فەجری ڕاست گۆ یان فەجری ڕاستەقینە ( الفجر الصادق ) :

---

ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێت کە ( **عدي** ) خۆی ئامادە بووە لە کاتی دابەزینی ئەم ئایەتەدا ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ لەو کاتەدا ( **عدي** ) موسوڵمان بووە ، بەڵام ئەو شتە وانیە ، چونکە فەرز بوونی ڕۆژوو لە ساڵی دووەمی کۆچیدا بوو ، کەچی موسوڵمان بوونی ( **عدي** ) لە ساڵی نۆیەمی کۆچیدا بوو هەر وەکو لە کتێبی : ( **الإصابة** ) دا : ( ٢ / ٤٦٨ ) هاتووە ، یان ئەبێ بووترێت : دابەزینی ئایەتەکە کە دواکەوتووە ، بەڵام ئەم ووتەیە زۆر دوورە ، یان ئەبێ ووتەکەی ( **عدي** ) کە دەفەرمووێت : ( **لما نزلت** ) بەم شێوەیە تەفسیر بکرێت کە : کاتێك موسوڵمان بووم و ئەم ئەم ئایەتەم بەسەردا خوێنرایەوە ، ئەمەیش باشترین بۆچوونە لەبەر ئەوەی کە لە ڕیوایەتی ئیمامی ( **أحمد** ) دا : ( ٤ / ٣٧٧ ) هاتووە : " علمني رسول الله ﷺ الصلاة والصيام ، قال : صل كذا و كذا ، وصم فإذا غربت الشمس فكل واشرب حتى يتبين لك الخيط الأبيض من الخيط الأسود ، وصم ثلاثين يوما إلا أن ترى الهلال قبل ذلك ، فأخذت خيطين من شعر أسود وأبيض ... الحديث " ا . هـ . بەهەندێ گۆڕانکاریەوە لە کتێبی ( **فتح الباري** )ەوە : ( ٤ / ١٣٢ – ١٣٣ ) وەرگێڕاوە .

ئەم جۆرەی فەجر خواردن لە ڕۆژوان قەدەغە دەکات و نوێـژی بـەیانی حـەڵاڵ دەکـات ( واتـە : بەدەرکەوتنی کاتی نوێژ دێت ) .

لە ( **ابن عباس** )ەوە رضي الله عنه دەگێڕنەوە فەرموویـەتی : " **الفَجْرُ فَجْرَان : فَأَمَّا الأَوَّلُ فَإِنَّهُ لا يُحَـرِّمُ الطَّعَامَ ، ولا يُحِلُّ الصَّلاةَ ، وَأَمَّا الثَّانِي : فَإِنَّهُ يُحَرِّمُ الطَّعَامَ ، وَيُحِلُّ الصَّلاةَ** " (٥٤).

واتە : فـەجر دوو فـەجرە ، جـۆری یەکـەم : خـواردن حـەرام و قەدەغـە ناکـات لـە ڕۆژووان ، وە کردنی نوێژیش حەڵاڵ ناکات ، بەڵام جـۆری دووەم : خـواردن حـەرام و قەدەغـە دەکـات لـە ڕۆژووان و نوێژیش حەڵاڵ دەکات .

## باش بزانە برای موسوڵمان کە :

١ ـ **فەجری درۆزن :** بریتی یە لە سپیایی یەکی لاکێشەیی لەبەرەی ڕۆژهەڵاتەوە بەرز دەبێتەوە بۆ ماوەیەکی کەم پاشان نامێنێ .

٢ ـ **فەجری ڕاستگۆ :** بریتی یە لـە سـوڕایەکی تیـشك دەر لـە بـەرەی ڕۆژهەڵاتـەوە بەسـەر دۆڵ و شاخەکاندا دەردەکەوێت ، پاشان زیاد دەکـات و دەگاتـە سـەر ڕێگـەو ناومـاڵان ، ئـەم جـۆرەی فـەجر حوکمەکانی ڕۆژووی پێوە بەندە .

لە ( **سمرة** ) وە رضي الله عنه دەگێڕنەوە فەرموویەتی : پێغەمبەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی : " **لا يَغُرَّنَّكُم أَذَآنُ بِلال ، ولا هَذا الْبَيَاض لِعَمُودِ الصُّبْحِ حَتى يَسْتَطِيْرُ** " (٥٥) .

واتە : بەئاگا بن نەکەونە هەڵەوە بە بانگی بـیلال ( واتـە : بـانگی یەکـەمی بـەیانیان ) و سـپیایی سـبەینان ـ واتـە : فـەجری درۆزن ـ کـە بەدرێـژای ئاسمـان بـەرز دەبێتـەوە ، تـا وای لێـدێت تیـشك دەردەچێ ـ واتە : تا کاتی دەرکەوتنی فەجری ڕاست گۆ ـ .

وە لـە ( **طلـق** ) ی کـوڕی ( **علـي** ) ەوە رضي الله عنه دەگێڕنـەوە فەرموویـەتی : پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتی : " **كُلُوا وَاشْرَبُوا وَلا يَغُرَّنَّكُمُ السَّاطعُ الُمصَعَّد ، وَكُلُوا واشْرَبُوا حَتَّى يَعْتَرِضَ لَكُمُ الأَحْمَر** " (٥٦) .

---

(٥٤) أخرجه ابن خزيمة : ( ٣ / ٢١٠ ) ، والحاكم : ( ١ /١٩١ و ٤٩٥ ) ، و الدارقطني : ( ٢ / ١٦٥ ) ، والبيهقي : ( ٤ / ٢٦١ ) من طريق سفيان ، عن جرير عن عطاء عن ابن عباس ، وسنده صحيح . وله شاهد عن جابر : أخرجه الحـاكم : ( ١ / ١٩١ ) ، و البيهقـي : ( ٤ / ٢١٥ ) والـدارقطني : ( ٢ / ١٦٥ ) واختلف في وصله و إرساله ، وشاهد آخر عن ثوبان : أخرجه ابن أبي شيبة : ( ٣ / ٢٧ ) .

(٥٥) أخرجه مسلم : ( ١٠٩٤ ) .

واتە : بخۆن و بخۆنەوە ، بەئاگا بن لەوەی بکەونە هەڵەی فەجری درۆزنەوە کە بەرز دەبێتەوە و پاش کەمێك نامێنێ ، بەڵکو بەردەوام بن لەخواردن و خواردنەوە تا تیشکی فەجری ڕاستگۆ ڕێگرتان دەبێت .

**ئەوەش بزانە** ـ برای سەرکەوتوو بۆ گوێڕایەڵی خوای پەروەردگار ـ کە سیفەتەکانی فەجری ڕاستگۆ لەگەڵ ئەم ئایەتە پیرۆزەدا یەك دەگرنەوەوە : ﴿ وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ﴾ چونکە ڕووناکی فەجر کە دەرکەوت لەبەرەی ڕۆژهەڵاتەوە لە دۆڵ و سەر شاخەکان لەسەر شێوەی پەتێکی سپی دەبێت لەسەریشەوە پەتێکی ڕەش دەردەکەوێت بریتی یە لە پاشماوەی تاریکی شەو کە پشتی هەڵکردوەو دەڕوات ، بۆیە ئەگەر ئەوەت بۆ ڕوون بووە خۆ بگرەوە لە خواردن و خواردنەوەو جووت بوون لەگەڵ خێزانەکەت ، وە ئەگەر پەرداخێکی ئاوت بەدەستەوە بوو یان هەر خواردن و خواردنەوەیەکی تر ، ئەوا دایمەنێ و بیخۆرەوە نۆشی گیانت بێ ، چونکە ڕێپێدانی ( میهرەبانترینی میهرەبانەکان ) بەرامبەر بەندەی ڕۆژووانانی با لەو کاتەیشدا گوێبیستی دەنگی بانگدەر بیت .

پێغەمبەری خوا ﷺ لەو بارەیەوە دەفەرموێت : " **إِذَا سَمِعَ أَحَدُكُمُ النِّداءَ والإناءُ في يَدِهِ فَلا يَضَعْهُ حَتَّى يَقْضِيَ حَاجَتَهُ مِنْهُ** " [٥٧] .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە گوێی لە بانگ بوو و پەرداخێکی بەدەستەوە بوو با دای نەنێت تاوەکو پێویستی خۆیی پێ تەواو دەکات .

مەبەست بە بانگ بانگی فەجری دووەمە کە فەجری ڕاست گۆیە ، بەو بەڵگەیەی کە ئیمامی ( **أحمد** ) : ( ٢ / ٥١٠ ) ، وە ( **ابن جرير الطبري** ) : ( ٢ / ١٠٢ ) ، وە جگە لەمانیش دەیگێڕنەوە لەدوای فەرموودەکەی سەرەوە : " **وَكَانَ الْمُؤَذِّنُ يُؤَذِّنُ إِذَا بَزَغَ الْفَجْرُ** " [٥٨] واتە : بانگدەر بانگی دەدا لە کاتی ئاشکرا بوونی فەجر .

---

[٥٦] أخرجه الترمذي : ( ٣ / ٧٦ ) ، أبو داود : ( ٢ / ٣٠٤ ) ، وأحمد : ( ٤ / ٢٣ ) ، وابن خزيمة : (٣ / ٢١١ ) من طريق عبد الله بن النعمان . وثقه ابن معين وابن حبان والعجلي ، ولم يعرف عدالته ابن خزيمة ، وقال ابن حجر : مقبول .

[٥٧] أخرجه أبو داود: (٢٣٥) ، وابن جرير: (٣١١٥) ، والحاكم: (٤٢٦/١) ، والبيهقي (٢١٨/٢) ، وأحمد: (٤٢٣/٢) من طريق حماد عن عمرو عن أبي هريرة ، وسنده حسن ، وله طريق آخر أخرجه أحمد : (٥١٠/٢) ، والحاكم : (٢٠٣/١ ، ٢٠٥) من طريق حماد ، عن عمار بن أبي عمار ، عن أبي هريرة وسنده صحيح .

[٥٨] هذه الزيادة تبطل ما علقه الشيخ حبيب الرحمن الاعظمى الحنيفي علي ( مصنف عبدالرزاق ) : ( ٤ / ١٧٣ ) حيث قال : ( وهو محمول علي النبي ﷺ كان ينادي قبل طلوع الفجر ) !! والحمد الله وحده .

وە ئـەو فەرموودەیـەی کـە ( **أبـو أمامـة** ) رضي الله عنه دەگێڕێتـەوە شـایەتی بـۆ ئـەم مانایـە دادات کـە دەفـەرمووێت : " أُقِيمَتِ الصَّلاةُ ، وَالإناءُ في يَدِ عُمَر ، قالَ : أشْرَبُهَا يا رَسُولَ اللهِ ؟ قالَ : نَعَم ، فَشَرِبَهَا " (٥٩) .

واتە : قامەت کرا بـۆ نوێـژ و پـەرداخێك بـە دەسـتی ( **عُمَـر** ) ەوە بـوو رضي الله عنه ، فـەرمووی : ئـەی پێغەمبەری خوا ﷺ بیخۆمەوە ؟ فەرمووی : بەڵێ ، ئەویش خواردیەوە .

کەوا بوو سەلمێنرا خۆگرتنەوە لە خواردن پێش فەجری ڕاستەقینە بەناوی ( **ئیمساك** ) و بەناوی ( **خۆپاراستنەوە ـ الاحطیاط** ) بیدعەیە .

ئیمامی ( **الحافظ بن حجر** ) ـ ڕەحمەتی خوای لـێ بێـت ـ لـە کتـێبی : ( **فـتح البـاري** ) دا ( ٤ / ١٩٩ ) دەفەرمووێت : (( یەکێك لەو بیدعە خراپانەی کە لەم کاتەدا داهێنراوە :

ئەنجام دانـی بـانگی دووەمـی بەیانیانـە پـێش فـەجر بـە سـێیەکی کاتـژمێرێك لـە ڕەمەزانـدا وە کوژاندنەوەی چراکان کە کراوەتە بەڵگە لەسەر قەدەغە کردنی خواردن و خواردنەوەو لەو کەسـەی کـە دەیەوێت بە ڕۆژوو بێت ، بە گومانی ئەوەی ئەم کارەیان بۆ بە ئاگا بوونە لە پەرستنەکەیدا . کەسـیش بەو کارەیان نازانێت جگە لە هەندێ کەس نەبێت ، ئـەم کارەیـان بـەرەو ئـەوەی ڕاکێـشان : کـە بـانگ نەدەن تا دوای خۆر ئاوا بوون ( بە ئەندازەیەك ) بۆ دڵنیا بوون لە هاتنی کات بە تەواوی . بـە گومـانی خۆیان . بەوەیش بەربانگیان دوا خـست و پەلەیـشیان کـرد لـە پاشـێو کردنـدا و پێـچەوانەی سـوننەت بوونەوە ۞ . بۆیە دەبینین چاکەیان کەم بووەو خراپەیان تێدا زۆر بوو ، تەنها خواش یارمـەتی دەرە . ))

---

(٥٩) أخرجه ابن جرير : ( ٢ / ١٠٢ ) من طريقين عنه .

۞ **تێبینی :** بەداخەوە ئێستا لە کوردستانی خۆشماندا ( **بـانگی یەکەم** ) ی بەیانی هەر نەماوە و ئەو بانگەیش کە ئێـستا دەدرێـت بۆ نوێژی بەیانی بە ئەندازەی ( **نیو سەعات کەمتر یان زیـاتر** ) پـێش دەرکـەوتنی فـەجری ڕاسـتگۆ پـێش خـراوەو هـەموو خـەڵکی موسوڵمان نوێژی بەیانیان لە کاتێکدا دەکەن کە لەڕاستیدا ئەو کاتە کاتی شەو نوێژە و کاتی ئیـستغفار و پاشـێو کردنـە نـەك کـاتی نوێژی بەیانیان ! ! ! ئەمە جگە لەمانگی ڕەمەزان ، بەڵام لە مانگی ڕەمەزاندا زیاد لەمە بیدعە بەناو ( **ئیمساك** ) یش زیادی کردووە و هەندێك لە موسوڵمانان بێ بەش و مەحروم دەکەن لە پاشێو کردن و بەم کردارە دوور لە قورئان و حەدیسە ئەوانـەیش کـە پاشـێو دەکەن پێچەوانەی سـوننەتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەکـەن چـونکە سـوننەت وایـە پاشـێو دوا بخرێـت ، هـەروەکو لـەم پەڕتوکـەدا ئاماژەی بۆ دەکرێت ، و لەوەش خراپتر نوێژی بەیانیان لەکاتی خۆیدا ناکەن ! ! !

**سوودێك :** لە پەڕتوکی ( **نظم الفرائد مما في سلسلتي الألباني من فوائد** ، جمع وترتيب : **عبداللطيف بن محمد بـن أبـي ربيـع** ( ١ / ٥٠٧ ــ ٥٠٩ ) طبعة مكتبة المعارف بالرياض ) دا ، و ( **باب / صفة الفجر الذي يوجب الإمساك** ) هاتووە :

(( عن طلق بن علي رضي الله عنه : أن النبي ﷺ قال : " كُلُوا وَاشْرَبُوا ، ولا يَهِيدَنَّكُم السَّاطِعُ المُصَعَّد ، فكلوا واشربوا حتى يَعْتَرِضَ لكُمُ الأحمر " (حديث حسن ، الصحيحة ، برقم : (٢٠٣١) .

**غريب الحديث :**

قوله : (**ولا يهيدنكم**) : أي لا تنـزعجوا للفجر المستطيل فتمنعوا به عن السحور : فإنه الصبح الكاذب ، وأصل ( الـهيد ) : الحركة . " نهاية " .

فائدة ( القول للألباني ـ رحمه الله ـ) : واعلم أنه لا منافاة بين وصفه ﷺ لضوء الفجر الصادق بـ(الأحمر) ، ووصفة ـ تعالى ـ إياه بقوله : (الخيط الأبيض ..) : لأن المراد ـ والله اعلم ـ بياض مشوب بالحمرة ، أو تارة يكون أبيض ، وتارة يكون أحمر ، يختلف ذلك باختلاف الفصول والمطالع . وقد رأيت ذلك بنفسي مرارا من داری في (جبل هملان) جنوب شرق (عمان) ، ومكنني ذلك من التاكد من صحة ما ذكره بعض الغيورين علي تصحيح عبادة المسلمين ، أن أذآن الفجر في بعض البلاد العربية يرفع قبل الفجر الصادق بزمن يتراوح بين العشرين و الثلاثين دقيقة ، أي قبل الفجر الكاذب أيضا ! وكثيرا ما سمعت إقامة صلاة الفجر من بعض المساجد مع طلوع الفجر من بعض المساجد مع طلوع الفجر الصادق ، وهم يؤذنون قبلها بنحو نصف ساعة ، وعلي ذلك فقد صلوا سنة الفجر قبل وقتها ، وقد يستعجلون بأداء الفرريضة أيضا قبل و قتها في شهر رمضان ، كما سمعتة من إذاعة دمشق وأنا أتسحر رمضان الماضي ( ١٤٠٦هـ ) ، وفي ذلك تضييق علي الناس بالتعجيل بالإمساك عن الطعام ، وتعرض لصلاة الفجر للبطلان ، وما ذلك إلا بسبب اعتمادهم علي التوقيت الفلكي ، وإعراضهم عن طريق الشرعي : ﴿ وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ﴾ ، " **فكلوا واشربوا حتى يعترض لكم الأحمر** " ، وهذه ذكرى ، والذكرى تنفع المؤمنين )) ا . هـ .

**وە بڕوانە :** (سلسلة الاحاديث الصحيحة) للإمام الألباني ـ رحمة الله ـ ( ٥ / ٥٠ – ٥١ ) حديث رقم : ( ٢٠٣١ ) .

**وە هەر بەمەیشەوە نەوەستاون : بەڵکو هەندێك كۆت و زنجیر و بیدعەی ڕەشیان داهێناوە و بەستویانە بە بانگی بەیانیانەوە وەك :**

**١ ـ ووتنی ( الإمساك ، الإمساك ، يا أمة محمد ) ، بە ماوەیەك پێش ئەو بانگەی كەلە كاتی خۆیدا نایدەن بە مەبەست خۆگرتنەوە لە خواردن ، وە ئەم بیدعەیە تایبەتە بە مانگی ڕەمەزانەوە .**

**٢ ـ ووتنی : ( أستغفر الله ، سبحان الله ، والحمد الله ، ولا إله إلا الله ، والله اكبر ، ولا حول ولا قوة إلا بالله ) چەند جارێك پێش ئەو بانگەی كە لە كاتی خۆیدا نادرێت .**

**٣ ـ ووتنی ( الصلاة والسلام عليك يا رسول الله ... ) وە چەند سەڵەواتێكی تری بیدعە ئامێز لەو چەشنەدا ( بەدەنگی بەرز ) دوای ئەو بانگەی كە لە كاتی خۆیدا نادرێت ، چونكە ووتنی سەلاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ بەو شێوازە بیدعەیە ، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوازە صەحابەی فێر نەكردووە ، و نەیشی فەرمووە دوای بانگ بەدەنگی بەرز سەلاوات لە سەرم بدەن ، بەڵكو فەرموویەتی : " إذا سمعتم المؤذن ، فقولوا مثل ما يقول ، ثم صلوا علي ، فإنه من صلى علي صلاة ، صلى الله عليه عشراً ، ثم سلوا لي الوسيلة ..." هتد فەرموودەكە ، كە لە ( صحيح مسلم ، برقم : ١٩٨ ) دا هاتووە .**

**واتاكەشی ئەوەیە : ئەگەر گوێتان لە بانگدەر بوو بانگی دا ئەوا ئێوەش وەكو ئەو بانگەكە بڵێنەوە ، ئەنجا سەلاوات لەسەر من بدەن ، چونكە هەر كەسێ سڵاوات لەسەر من بدات ئەوا خوای گەورە دە جار سڵاواتی لەسەری دەدات ، ئەنجا داوای پلەی وەسیلەم بۆ بكەن ... ، لەم فەرموودەیە ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كە : تەنها ئەوانی كە بانگ دەبیسن داوایان لێ كراوە سەلاوات بدەن نەك بانگ دەر ، وە شێوەی سەلاوات دان لەسەر سوننەت لەم فەرموودەیەدا ڕوون كراوەتەوە كە لە (كعب)ی كوڕی (عجرة) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی :**

**" قلنا يا رسول الله قد علمنا أو عرفنا كيف السلام عليك ، فكيف الصلاة ؟ قال : قولوا : اللهم صل على محمد وعلى آل محمد كما صليت على إبراهيم إنك حميد مجيد "** (صحيح البخاري رقم : ٦٣٥٧ ، وصحيح مسلم رقم : ٤٠٦ ) .

**وە هەر بەم سەرپێچیانەوە كە لە بانگی بەیانیاندا دەكرێت نەوەستاون ! بەڵكو بانگی مەغریبیش دوا دەخەن بەئەندازەی ( ١٠ ) دەقیقە كەم تر یان زیاتر بەناوی ( دڵنیا بوون و إحطياط ) ەوە ، بەمەش دەكەونە ناو سەرپێچیەكی ترەوە دەر حەق بە سوننەتەكانی پێغەمبەرەوە ﷺ ، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ دیار نەمانی بازنەی خۆردا ( قرص الشمس ) ڕۆژووەكەی دەشكاند ، وە چاوەڕوانی دیار نەمانی سووراییی یان دەركەوتنی ئەستێرەی نەدەكرد، و پاشان یەكسەر دەستی بە نوێژ دەكرد و هیچ دوای نەدەخست . عن (سلمة)ی كوڕی (الاكوع)ەوە ﷺ قال : " أن رسول الله ﷺ كان يصلي المغرب إذا غربت الشمس و توارت بالحجاب "** ( صحيح البخاري رقم : ٥٦١ ، وصحيح مسلم رقم : ٦٣٦ ) .

ئێمەش دەڵێین : تاکو ئێستا ئەو بیدعەیە کە بەناوی ( **الإمساك** ) ەوە دەکرێ پێش دەرکەوتنی فەجر و هاتنی کات ، وە هەر بەردەوامە تا کاتی ئێستای خەڵکی … ئەو گلەییەشمان بۆ لای خوا بەرز دەکەینەوە .

## ٣ ـ پاشان ڕۆژووەکەی تا کاتی هاتنی شەو تەواو دەکات :

ئەگەر شەو لەبەرەی ڕۆژهەڵاتەوە دەرکەوت ، و خۆریش لە بەرەی ڕۆژ ئاواوە پشتی لێ هەڵکردین و خۆریش ئاوا بوو : ئەو کاتە ڕۆژوان ڕۆژووەکەی دەشکێنێت .

لە (**عمر**)ی کوڕی (**الخطاب**) ەوە ﵁ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " إذَا أَقْبَلَ الليلُ مِنْ هَاهُنَا ، وأَدْبَرَ النَّهارُ مِنْ هَاهُنَا ، وَغَرَبَت الشَّمسُ : فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ " (٦٠) .

واتە : ئەگەر شەو لێرەوە دەرکەوت و ڕۆژیش لە ئێرەوە پشتی لێ هەڵکردین و خۆریش ئاوا بوو : ئەوا ڕۆژووەکەتان بشکێنن .

ئەم فەرمانەی پێغەمبەری خوایش ﷺ یەکسەر پاش ئاوا بوونی بازنەی خۆر دەبێت بە جێ بهێنرێت با ڕووناکی یەکەیشی هەندێ مابێ ، چونکە یەکێکە لە سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو کاتێك بە ڕۆژوو دەبوو فەرمانی بەیەکێك لە صەحابە دەکرد کە بچێتە سەر شتێك و لە کاتی دیار نەمانی بازنەی خۆر دەیفەرموو : خۆر ئاوا بوو ، پێغەمبەریش ﷺ ڕۆژووەکەی دەشکاند (٦١) .

---

ئەم بابەتەش زیاتر ڕوون کراوەتەوە لە خاڵی سێیەمدا کە لەمەو دوا باسی لێوە دەکرێت ـ وەرگێڕ ـ .

(٦٠) أخرجه البخاري : ( ٤ / ١٧١ ) رقم : ( ١٩٥٤ ) ، ومسلم رقم : ( ١١٠٠ ) ، و مەبەستی لە ووتەی : " أفطر الصائم " واتە : لە ڕووی واقعەوە ، چونکە کاتی بەر بانگ هاتووە و چوەتە ناو ئەو کاتەوە کە کاتی ڕۆژوو شکاندنە .

(٦١) أخرجه الحاكم : (٤٣٤/١) ، وابن خزيمة رقم : (٢٠٦١) ، وصححه الحاكم على شرط الشيخين . ووتەی : " **أوفى** " واتە : چونە سەر شتێك و ڕوانین بۆ شوێنێك .

**سوودێك :** پێشەوا و فەرموودەناسی سەردەم ( **العلامة محمد ناصر الدين الألباني** ) ـ بەڕەحمەت بێت ـ لە ( **سلسلة الاحاديث الصحيحة** ) : ( ٥ / ١١٨ ) دا ، و لە ژێر ناونیشانی (**مراقبة غروب الشمس لتعجيل الافطار**) : (٢٠٨١) فەرموویەتی : ((كان النبي ﷺ إذا كان صائما أمر رجلاً فأوفى علي نشز ، فإذا قال : قد غابت الشمس أفطر)) أخرجه الحاكم : (٤٣٤/١) عن محمد بن أبي صفوان الثقفي ثنا عبد الرحمن بن مهدي : ثنا سفيان عن أبي حازم عن سهل بن سعد ﵁ مرفوعا . وقال : ( صحيح علي شرط الشيخين ، لكن ابن مهدي ليس من شيوخهما ) .

قوله ( نشز ) أي : مرتع من الارض .

قلت : وفي الحديث اهتمامه ﷺ بالتعجيل بالإفطار بعد أن يتاكد ﷺ من غروب الشمس ، فيأمر من يعلوا مكانا مرتفعا ، فيخبره بغروب الشمس ليفطر ﷺ ، وما ذلك منه إلا تحقيقا منه لقوله ﷺ : " لا يزال الناس بخير ما عجلوا الفطر " متفق عليه ، وهو مخرج في (الإرواء) رقم : (٩١٧) .

وأن من المؤسف حقا أننا نرى الناس اليوم ، قد خالفوا هذه السنة ، فإن الكثيرين منهم يرون غروب الشمس بأعينهم ، ومع ذلك لا يفطرون حتى يسمعون أذان البلد ، جاهلين :

وە هەندێك لە خەڵك وا گومان دەبەن كەوا شەو نايەتەدی بە خۆر ئاوا بوون ، بەڵكو ئەو كاتە بە شەو دادەنێن كە تاريكی بڵاو دەبێتەوە بە لای ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاواوە ، وە ئەم گومانەيش ڕوويداوە بۆ هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ، وە بەڵام تێگەيەنرا كەوا خۆر ئاوا بوونی خۆر بەسە بۆ هاتنی شەو كە سەرەتای تاريكی لە بەرەی ڕۆژهەڵاتەوە دەركەوێت دوای نەمانی بازنەی خۆر يەكسەر .

لە ( **عبد الله** )ی كوڕی ( **أبي أوفى** ) ەوە رضي الله عنه دەگێڕنەوە فەرمووی : " لە سەفەرێكا لە گەڵ پێغەمبەری خوادا بوون ﷺ ، وە بە ڕۆژوو بووين لە مانگی ڕەمەزاندا ، كاتێك خۆر ئاوا بوو فەرمووی : ئەی فلان ، وە لە ڕيوايەتی ئيمامی ( **أبو داود** ) دا : ئەی **بلال** هەستە ئاومان بەرێ ، ئەويش فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر چاوەڕێ بكەی شەوت بەسەردا بێت لە ڕيوايەتی ئيمامی ( **البخاري** ) دا : " **لَو انْتَظَرْتَ حَتَى تُمْسِي** " ، وە لە ڕيوايەتێكی تردا : " ... **الشَّمسَ** ... " ، پاشان فەرمووی : دابەزە ئاومان بەرێ ، ئەويش فەرمووی هێشتا ڕۆژت بەسەرەوەيە ! فەرمووی : دابەزە ئاومان بەرێ ، پاش جاری سێيەم دابەزی و ئاوی پێدان و پێغەمبەريش خوارديەوە و فەرمووی : ئەگەر يەكێك بيەوێ بەسەر ووشترەكەيەوە ببينێ ئەوا دەيبينێ ـ واتە : خۆر دەبينێ ـ پاشان ئاماژەی كرد وە لە ڕيوايەتی ئيمامی ( **البخاري** ) دا : بە دەستی ئاماژەی كرد ، وە لە ڕيوايەتی ( **البخاري و مسلم** ) دا : بە پەنجە ئاماژەی بۆ بەرەی ڕۆژ ئاوا كرد ، پاشان فەرمووی : " **إِذَا رأَيْتَ الليلَ قَدْ أقبَلَ مِنْ هَاهُنَا فَقَد أفْطَرَ الصَّائِمُ** " (٦٢) .

واتە : ئەگەر بينيت شەو لە بەرەی ڕۆژئاواوە هەڵهات ئەوا با ڕۆژووان ڕۆژووەكەی بشكێنێت . ئەوەشمان پێگەيشتووە كە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ شوێنی ووتەی پێغەمبەر ﷺ كەوتوون بۆيە كردەوەيان جووت بووە لە گەڵ ووتەكانی پێغەمبەر ﷺ بۆ نموونە : ( **أبو سعيد الخدري** ) رضي الله عنه پاش ئاوا بوونی بازنەی خۆر ڕۆژووەكەی دەشكاند (٦٣) .

## بيرخستنەوەيەك :

---

أولا : أنه لا يؤذن فيه على رؤية الغروب ، وإنما على التوقيت الفلكي .

وثانيا : أنَّ البلد الواحد قد يختلف الغروب فيه من موضع إلى آخر بسبب الجبال و الوديان ، فرأينا ناسا لا يفطرون وقد رأوا الغروب ! وآخرين يفطرون و الشمس بادية لم تغرب ، لأنهم سمعوا الأذان ! والله المستعان ! ) ا . هـ ـ وەرگێڕ ـ .

(٦٢) أخرجه البخاري : ( ٤ / ١٩٩ ) رقم : ( ١٩٥٥ ) ، ومسلم رقم : ( ١١٠١ ) ، واحمد : ( ٤ / ٣٨١ ) ، وأبو داود رقم : ( ٢٣٥٢ ) . والزيادة الأولى لمسلم رقم : ( ١١٠١ ) . والثانية لعبد الرزاق : ( ٤ / ٢٢٦ ) .

ئەم فەرموودەيە سودێكی زۆری تێدايە بۆ ئەو زانينيان سەيری كتێبی ( فتح الباری : ٤ / ١٩٨ ) بكە .

ووتەی : " **إجْدَحْ لَنَا** " ، واتە : خواردن و خواردنەوەمان بۆ ئامادە بكە . ( وأصل الجدح : تحريك السويق واللبن بالماء بعود ) ، واتە : بنەڕەتی ئەم ووشەيە تێكەڵ كردنی ( سەويق ) و شير و تێكدانی بە چيلكە دارێك دەگەيەنێت .

(٦٣) علقه البخاري : (٤ / ١٩٦) ، ووصله ابن أبي شيبة في (المصنف) : (٣ / ١٢) ، وسعيد بن منصور كما في (الفتح) : (٤ / ١٩٦) و (عمدة القاري) : (٩ / ١٣٠) وانظر : (تغليق التعليق) : (٣ / ١٩٥) .

ئەو حوکمانەی ڕۆژوو کە لە پێشەوە باسمان لێ وە کرد پەیوەندە بە بینینی بینای ( واتە : بینینی چاوی مرۆڤ ) و نابێ ( تەکەلوف ) و زیادەڕەویان تێدا بکرێت و بە ( ئامێری گەردوونی و فەلەکی ) تازە سەیری مانگ بکرێت یان بەو ئامێرانەی سەیری فەجر بگرێت ، چونکە ئەم شتە وای لە موسوڵمانان کردووە دوور بکەونەوە لە سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆیە دەبینین چاکەیان تێدا کەم بووەتەوە و خراپەیان تێدا زوو بووە [٦٤] ، خواش زاناترە .

## بیرخستنەوەیەکی تر :

لە هەندێك لە وڵاتانی ئیسلامدا بانگ دەران پشت دەبەستن بە ڕۆژمێری وا کە زیاد لە (٥٠) پەنجا ساڵ بەسەر دانانیاندا ڕۆیشتووە ، بۆیە بەر بانگ ( **إفطار** ) دوا دەخەن و پارشێویش (**سحور**) پێش دەخەن ، بەوەش ئەکەونە ناو پێچەوانە کردنی سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ ، دەبینین لە هەندێ لەو وڵاتانەدا کۆمەڵانێکی پابەند بوون بە سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ هەڵدەستن بە بەربانگ کردنی بە پێی خۆر و پارشێویشیان بە پێ ی فەجر دەکەن ، بۆیە کاتێ خۆر ئاوا بوو ڕۆژوو دەشکێنن و لە کاتی دەرکەوتنی فەجری ڕاستگۆدا هەر وەکو لە پێشدا باس کرا واز لە خواردن و خواردنەوە دێنن ، کردەوەی ئەم کۆمەڵەیە کردەوەیەکی شەرعی‌یە و ڕەوایشە بە بێ گومان ، ئەو کەسەیش بە هەڵەیان دەزانێت : لە ڕاستیدا خۆی بە هەڵەدا چووە هەڵەیەکی ئاشکرا ، وە ( لا حول ولا قوة إلا بالله ) .

شاراوەیش نیە ئەم پەرستنە پەیوەستە بە خۆر و فەجری ڕاستگۆوە ، جا ئەگەر کۆمەڵێك پێچەوانەی هەستانە : ئەوا خۆیان هەڵەن نەك ئەوانەی کە پابەند بە (**أصل**) و بنچینەوە و لەسەری بەردەوامن ، چونکە بانگ دان بریتی یە لە ئاگەدار کردنەوەی موسوڵمانان بە هاتنی کاتی نوێژ ، جا ئەگەر کاتی نوێژ هات و بانگ نەدرا ، یان بانگ دراو کاتی نوێژ نەبوو ، مانەوە لەسەر (**أصل**) و بنچینە پێویستە نەك شتی تر . ئەم خاڵەت لەیاد بێ و باش بیری لێ بکەرەوە .

# پارشێو ( واتە : السُّحور )

## ١- حیکمەت لە پارشێو :

[٦٤] هەر کەسێك بیەوێت زیاتر شتەکەی لا ڕوون بێت و درێژەی باسەکە بزانێت بە چاکی ئەوا دەستی دەکەوێت لە دوو توێی ئەم کتێبانەدا :

أ / ( مجموع فتاوى ) : ( ٢٥ / ١٢٦ ــ ٢٠٢ ) لشيخ الإسلام ابن تيمية .

ب / ( المجموع شرح المذهب ) : ( ٦ / ٢٧٩ ) للنووي .

ج / ( التلخيص الحبير ) : ( ٢ / ١٨٧ – ١٨٨ ) لابن حجر .

خوای پەروەردگار ڕۆژووی لەسەر فەرز کردووین هەر وەکو چۆن لەسەر ئوممەتانی خاوەن پەڕتوک ( **أهل الكتاب** ) ی لە پێشدا فەرز کردووە ، خوای پایە بەرز دەفەرمووێ : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ [البقرة : ١٨٣].

بەشێوەیەك كە ڕۆژووەكەمان لەكات و حوكمدا لەگەڵ ڕۆژووی ئوممەتانی خاوەن پەڕتوك ( **أهل الكتاب** ) دا یەكیان دەگرتەوە ، كە پێویست بوو خواردن و خواردنەوە و جووت بوون لەگەڵ خێزاندا نەكرێت دوای خەوتن : واتە ئەگەر یەكێك لێیان خەوی لێ بكەوتبایە ئەوا بۆی ڕەوا نەبوو خواردن بخوات تا شەوەكەی تری بەسەردا دێت ، ئەویش لەسەر موسوڵمانان فەرز كرا هەر وەكو چۆن پێشتر باسمان كرد [٦٥] ، بەڵام كاتێ ( **نەسخ** ) كرایەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی كرد بە پارشێو كردن بۆ جیا كردنەوەی ڕۆژووی موسوڵمانان لە ڕۆژووی ئوممەتانی خاوەن پەڕتوك ( **أهل الكتاب** ) .

لە (**عَمر**)ی كوڕی (**العاص**) ەوە رضي الله عنه دەگێڕنەوە فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : " **فَصْلُ مَا بَيْنَ صِيامِنَا وَصِيامِ أَهْلِ الكِتابِ : أَكْلَةُ السُّحُرِ** " [٦٦].

واتە : جیا كەرەوەی ڕۆژووی ئێمە و ڕۆژووی ئوممەتانی خاوەن پەڕتوك ( **أهل الكتاب** ) : خواردنی پارشێوە .

## ٢ ـ چاكەكانی پارشێو ( فضل السحور ) :

### أ / پارشێو كردن بەرەكەتی تیایە :

لە ( **سلمان** ) ەوە رضي الله عنه دەگێڕنەوە فەرموویەتی : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : " **البَّرَكَةُ فِي ثَلاثَةٍ : الجَمَاعَة ، والثَّرِيْد ، والسُّحُور** " [٦٧].

---

[٦٥] بۆ زانینی زیاتر بڕوانە ئەم كتێبە تەفسیرانەی خوارەوە :

أ / ( زاد الميسر ) : ( ١ / ١٨٤ ) لابن الجوزي .

ب / ( تفسير القران العزيم ) : ( ١ / ٢١٣ ــ ٢١٤ ) لابن كثير .

جـ / ( الدر المنثور ) : ( ١٢٠١ ــ ١٢١ ) للسيوطي .

[٦٦] أخرجه مسلم رقم : ( ١٠٩٦ ) .

[٦٧] أخرجه الطبراني في (الكبير) رقم : (٦١٢٧) ، وأبو نعيم في (ذكر أخبار أصفهان) : (٥٧/١) عن سلمان الفارسي . قال الهيثمي في (المجتمع) : (١٥١/٣) : (وفيه أبو عبدالله البصري ، قال الذهبي : لا يعرف ، وبقية رجاله ثقات) . وله شاهد عن أبي هريرة : أخرجه الخطيب في (موضح أوهام الجمع والتفريق) : (١ / ٢٦٣) ، وسنده حسن في الشواهد .

**برای موسوڵمان :** زۆر لە كەسانی بیر تەسك و نەزان و دەمارگیر لە كۆمەڵە ئیسلامیەكان كە ئێستا لە گۆڕەپانی جیهاندا بە گشتی و گۆڕەپانی كوردستانی خۆشمان بە تایبەتی هەن : ئەم ووشەیەی (**الجماعة**) بە شێوەیەكی ناڕەوا لێك دەدەنەوە و تەفسیری دەكەن ، و

واتە : بەرەکەت لە سێ شت دایە : جەماعەت ، و تریت ( نانەوڵە ) ، و پارشێو کردن .

وە لە ( **أبو هريرة** ) وە ﷺ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : " **إِنَّ اللهَ جَعَلَ البَرَكَةَ فِي السُّحُورِ والكَيْلِ** " (٦٨) .

واتە : خوای پەروەردگار بەرەکەتی خستووەتە پارشێو و پێوانەکردنەوە .

وە لە (**عبد الله**)ی کوڕی (**الحرث**)ەوە دەگێڕنەوە لە پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : خەریکی پارشێو کردن بووم پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە و پێی فەرمووم : " **إِنَّها بَرَكَــةٌ أعْطَاكُم اللهُ إيَّاهَا فَلا تَدَعُوه** " (٦٩).

واتە : ئەم پارشێوە بەرەکەتە خوا پێی بەخشیون ، نەکەن لە دەستی بدەن .

بەرەکەتی پاشێوکردنیش ئاشکرایە ، چونکە شوێن کەوتنی سوننەتە ، بە هێزکەریشە بۆ بە ڕۆژوو بوون لەبەر سووکی ڕۆژووەکە لەسەر ڕۆژووان ، هەروەها ئەنجام دانی پێچەوانەی کاری ئوممەتە خاوەن پەڕتوکەکانە ( **أهل الكتاب** ) ە ، چونکە ئەوان پارشێو ناکەن ، بۆیە ئەبینین پێغەمبەری

---

دەڵێن : ئەو کەسەی کە لە کۆمەڵێك لەو کۆمەڵانەدا نەبێت ئەوا بەرەکەت لە کایدا نیە !!! وە مردنەکەشی مردنێکی نەفامی ( واتە : **جاهلي** ) یە !!! یان پێی دەڵێن : ( **لا جماعة** ) !!!!! بەڵام لە ڕاستیدا ئەم ووشەیە ( **الجماعة** ) مەبەست پێی :

١ / ( **أهل الحديث** ) ە هەروەك پێشەوا ( **علي** ) کوڕی ( **مديني** ) ، و پێشەوا ( **أحمد** ) ی کوڕی ( **حنبل** ) ـ بەڕەحمەت بن ـ فەرموویانە .

٢ / یان ( **أهل العلم** ) ە هەروەك هەندێك لە زانایان فەرموویانە .

٣ / یان هاودەنگی و هاوکۆك بوونە لە گەڵ حەقدا ( **موافقة الحق** ) ە ، هەروەکو ( **ابن مسعود** ) فەرموویەتی : " **الجماعة ما وافق الحق ولو كنت وحدك** " .

٤ / یان ( کۆمەڵی گەورەی موسوڵمانان )ە کە پێیان دەوترێت : (**أهل السنة والجماعة**) .

یان هەر ناوێکی تر کە زانایان بە ڕەوای دەزانن ، نەك ئەو کۆمەڵە چەواشە کارانەی کە ئێستا بەربڵاون لە جیهان دا .

لەوەش زیاتر هەندێکیان خۆیان بە ( **الجماعة** ) دەزانن و خەڵکانی موسوڵمانی تر بە سەرپێچی کار دادەنێن ، و بە تاوان باریان دەزانن بە گومانی خۆیان و هەموو ئەو فەرموودانەی لەم بارەیەوە هاتوون بە سەریاندا دەیسەلمێنن .

**جا موسوڵمانی ژیر :** لەو فریودانەی بە ئاگا بەو نەکەی بکەویتە ئەو داوەوە ، چونکە بانگەوازکەرانی ئەو فریودانە زۆرن خوا پەنامان بدات لە حزبایەتی . بۆ زیاتر بە ئاگا بوون لەم مەسەلەیە بڕوانە : گۆڤاری ( ڕێگای ڕاست ) :

أ ـ ژمارە یەك : ( ١٧٩ ـ ١٨٦ )

ب ـ ژمارە دوو : ( ٣٥ ـ ٥١ )

ج ـ ژمارە سێ : ( ٤٩ ـ ٦٥ ) ـ وەرگێڕ ـ .

(٦٨) أخرجه الشيرازي في ( الألقاب ) ـــ كما في ( الجامع الصغير ) رقم : ( ١٧١٥ ) ، والخطيب في (الـــموضح) : ( ١ / ٢٦٣ ) عن أبي هريرة بالسند الـــسابق نفسه . وهو حسن في الشواهد ، ويشهد له ما قبله ، و بيض له المناوى في ( فيض القدير ) : ( ٢ / ٢٢٣ ) فكأنه لم يقف على سنده !

(٦٩) أخرجه النسائي : ( ٤ / ١٤٥ ) ، و أحمد : ( ٥ / ٢٧٠ ) ، وسنده صحيح .

ڕەحمەت ﷺ ناوی لێ ناوە : ( **الغذاء المبارك** ) واتە : خواردنی بە پیت و بەرەکەت ، هەروەکو لە فەرموودەی ( **العرباض** )ی کوڕی ( **سارية** ) ەو ( **أبي الدرداء** ) ەوە رضي الله عنه هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " **هَلُمَّ إلى الغِذَاءِ المُبَارَك : يَعْنِي السُّحُور** " [٧٠].

واتە : وەرن بۆ خواردنی بە پیت و بەرەکەت ، واتە : پارشێو .

**ب / خوای پەروەردگار و فریشتەکانی صەلاوات دەدەن لەسەر ئەو کەسانەی پاشێو دەکەن :**

لەوانەیە گەورەترین بەرەکەتی پارشێو ئەوە بێ کە ڕۆژووانان لێ خۆشبوونی خوای پایە بەرز و پاك و بێگەرد دەیانگرێتەوە و ڕەحمەتی خۆی بە سەردا ڕشتوون ، وە هەروەها فریشتەکانی ئەو خوا میهرەبان و بەڕەحمە دەپاڕێنەوە و داوای لێ خۆشبوونیان بۆ دەکەن ، بۆ ئەوەی لە کۆمەڵی ڕزگار بووانی خوا بژمێررێن لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا .

لە (**أبو سعيد الخدري**)ەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە فەرموویەتی : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : " **السُّحُورُ أَكْلَةٌ بَرَكَة ، فَلا تَدْعُوهُ ، وَلَو أَنْ يَجْرَعَ أَحَدُكُم جُرْعَةً مِنْ مَاءٍ ، فَإِنَّ اللهَ ، وَمَلائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلى المُتَسَحِّرِينَ** " [٧١] .

واتە : پارشێو کردن خواردنێکی بە بەرەکەتە ، نەکەن لە دەستی بدەن ، ئەگەر بە خواردنەوەی قومێك ئاویش بۆ بێ ، چونکە خوای پەروەردگار و فریشتەکانی صەلاوات دەدەن لەسەر ئەو کەسانەی پارشێو دەکەن . بۆیە پێویستە هیچ موسوڵمانێك ئەم پاداشتە گەورەیەی خوای بەڕەحم و میهرەبان لە دەست نەدات .

وە باشترین خواردن لە پارشێودا ( **خورمایە** ) : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : " **نِعْمَ سُحُور المُؤْمِنِ التَّمْرُ** " [٧٢] .

واتە : باشترین خواردنی ئیماندار لە پارشێودا بریتیەیە لە : خورما ، وە ئەگەر کەسێك هیچ شتێکی دەست نەکەوت ئەوا هیچ نەبێ با قومێك ئاو بخواتەوە لەبەر ئەو شتانەی کە باسمان لێ وە کردن ، وە لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی : " **تَسَحَّرُوا وَلَوْ بِجُرْعَةِ مَاءٍ** " [٧٣] .

---

[٧٠] أما حديث العرباض : فاخرجه أحمد : ( ٤ / ١٢٦ ) ، و أبو داود : ( ٢ / ٣٠٣ ) ، والنسائي : ( ٤ / ١٤٥ ) من طريق : يونس بن سيف عن الحارث بن زياد عن أبي رَهْم عن العرباض . وفيه الحارث ، وهو مجهول . وأما حديث أبي الدرداء : فرواه ابن حبان رقم : ( ٢٢٣ ـــ موارد الظمئان ) من حديث المقدام بن معديكرب ، رواه أحمد : ( ٤ / ١٣٣ ) ، و النسائي : ( ٤ / ١٤٦ ) . و سنده صحيح ، إن سلم من بقية ، فإنه صرح بالتحديث عن شيخه ! لكن هل ذلك كاف أم ؟ لا بد من التصريح بالتحديث في كافة طبقات السند ، فهو من مدلسي التسوية ؟! فالحديث صحيح .

[٧١] أخرجه ابن أبي شيبة : ( ٣ / ٨ ) ، و أحمد : ( ٣ / ١٢ ) و ( ٣ / ٤٤ ) من ثلاثة طرق عن أبي سعيد الخدري ، و يشد بعضها بعضا .

[٧٢] أخرجه أبو داود : ( ٢ / ٣٠٣ ) ، وابن حبان رقم : ( ٢٢٣ ) ، والبيهقي : ( ٤ / ٢٣٧ ) من طُرقٍ عن محمد بن موسى عن سعيد المقبري عن أبي هريرة ، وسنده صحيح .

واتە : پارشێو بکەن ئەگەر بە قومێك ئاویش بێت .

## ٣ ـ دوا خستنی پارشێو :

سوننەت وایە پارشێو دوا بخرێت بۆ کەمێك پێش دەرکەوتنی فەجری ڕاستەقینە ، چونکە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ( **زید بن ثابت** ) رضي الله عنه کاتێك کە لە پارشێوەکەیان بوونەوە ، پێغەمبەر ﷺ هەستا بۆ نوێژ و نوێژی کرد ، ماوەی نێوان لێ بوونەوەیان لە پارشێو کردنەکە و دەست پێ کردنی نوێژەکەیان نزیکەی خوێندنەوەی ( ٥٠ ) پەنجا ئایەتی قورئانی پیرۆز دەبوو .

( **أنس** ) رضي الله عنه لە( **زید** ) ی کوڕی ( **ثابت** ) ەوە دوگێڕێتەوە کە فەرموویەتی : " **تَسَحَّرْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ ثُمَّ قَامَ إلى الصَّلاةِ ، قُلْتُ : كَمْ كَانَ بَيْنَ الأذانِ والسُّحُورِ ؟ قَالَ : قَدْرُ خَمْسِينَ آيَة** " [٧٤] .

واتە : پارشێومان دەکرد لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ پاشان هەستا بۆ نوێژ ، ( **أنس** ) رضي الله عنه دەفەرمووێ : لێم پرسی : نێوان بانگ دان و نوێژ کردن چەندی خایاند فەرمووی نزیکەی ( ٥٠ ) ئایەتی قورئانی پیرۆز بوو .

**ئەوەش بزانە ئەی بەندەی خوا** ـ خوای پەروەردگار ڕێنیشاندەرت بێ ـ : کە خواردن و خواردنەوە و جووت بوون لەگەڵ خێزانت ڕەوایە ئەگەر دوو دڵ بی لە دەرکەوتنی فەجری ڕاستگۆ و ئاشکرا بوونی ، چونکە خوای پایە بەرز پێنوسی تاوانی هەڵگرتووە لەسەر هەڵە کردن و لە بیر چونەوە ، وە خواردن و خواردنەوە و جووت بوونی لەگەڵ خێزان دا حەڵاڵ کردووە تا کاتی ئاشکرابوونی فەجری ڕاستگۆ ، ئەو کەسەش گومانی لە دەرکەوتنی هەبێ ، دەرکەوتنی فەجری لا ئاشکرا نەبووە ، چونکە ئاشکرا بوون دڵنیا بوونە و ئەبێ گومانی لەو کارەدا نەبێ ، جا باش بزانە .

## ٤ ـ حوکمی پارشێو :

لەبەر هەموو ئەو شتانەی کە باس کران دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە پارشێو کردن کردووە . فەرمانێکی جەخت لەسەر کراو لەو بارەیەوە دەفەرمووێ : " **مَنْ أَرَادَ أن يَصُومَ فَلْيَتَسَحَّر بِشَيءٍ** " [٧٥] ، واتە : ئەو کەسەی کە ئەیەوێت بە ڕۆژوو بێت ، با بە شتێك پارشێو بکات .

---

[٧٣] أخرجه أبو يعلى رقم : ( ٣٣٤٠ ) عن أنس ، وفيه ضعف . ويشهد له حديث عبدالله بن عمرو عند ابن حبان رقم : ( ٨٨٤ ) ، وفيه عنعنة قتادة ، فالحديث حسن .

[٧٤] أخرجه البخاري : ( ٤ / ١١٨ ) رقم : ( ١٩٢١ ) ، ومسلم رقم : ( ١٠٩٧ ) .

وە ئیمامی ( **الحافظ ابن حجر** ) لە کتێبی ( **فتح الباري** ) دا : ( ٤ / ١٣٨ ) : دەفەرمووێت : (ئادابی عەرەب وابوو بۆ دیاری کردنی کات دەیان شوبهاند بە کردەوەیەکیان ، بۆ نمونە : ئەوەندەی مەڕ دۆشینێك ، یان کاتی نێوان دوو دۆشینی ووشترێك ، یان کاتی ووشتر سەربڕینێك ، بەڵام دەبینین ( **زید** ) لە جیاتی ئەو کردەوانەی ئەو کاتەی شوبهاندووە بە خوێندنەوەی قورئان ، ئەمەیش ئاماژەیە لە ( **زید** ) ەوە رضي الله عنه بۆ ئەوەی ئەو کاتە کاتی پەرستنە و کردەوەی ئەوانیش خوێندنەوەی قورئان بووە بەتێفکراندنەوە)) . وەرگیراوە بە هەندێك دەست کاریەوە .

[٧٥] رواه ابن أبي شيبة : ( ٣ / ٨ ) ، وأحمد : ( ٣ / ٣٦٧ ) ، وأبو يعلى : ( ٣ / ٤٣٨ ) ، والبزار : ( ١ / ٤٦٥ ) من طريق شريك عن عبدالله بن محمد بن عقيل عن جابر . وشريك ضعيف . لكن له شاهداً مرسلاً عن سعيد بن منصور في ( سننه ) بلفظ : " **تسرحوا ولو بلقمة** " . كما قال الحافظ في ( الفتح ) : (٤ / ١٤٠) ، وله شاهد آخر ، وهو الآتي بعد ثلاثة أحاديث .

وە دەفەرمووێ : " تَسَحَّروا فَإنَّ في السُّحورِ بَرَكَة " [٧٦] .

پاشان نرخی پارشێوی سەبارەت بە ئوممەتەکەی ئاشکرا کردووە ، و دەفەرمووێ : " فَصْلُ مَا بَيْنَ صِيَامِنَا وصِيَامِ أهلِ الكتابِ أَكْلَةُ السَّحرِ" [٧٧] .

وە ئەوەشی قەدەغە کردووە کە موسوڵمان وازی لێ بێنێت و دەفەرمووێ : " السُّحورُ أكلَةُ بَركَةٍ ، فلا تَدَعُوهُ ، وَلَو أن يَجْرَعَ أحَدُكُم جُرْعَةً مِن مَاءٍ ، فَإنَّ اللهَ ـعزوجل ـ ومَلائِكَتَهُ يُصلونَ عَلَى المُتَسَحِرينَ " [٧٨] .

وە دەفەرمووێ : " تَسَحَّرُوا وَلَو بِجُرْعَةٍ مِنْ مَاءٍ " [٧٩] .

**ئێمەیش لـــەم بارەیەوە دەڵێین :** وا دەبینین فەرمانی پێغەمبەر ﷺ لێرەدا فەرمانێکی جەخت لەسەر کراوە لە سێ ڕووەوە :

أ / فەرمان پێ کردنی .

ب / دروشمی ڕۆژووی موسوڵمانانە ، وجیا کەرەوەی نێوان ڕۆژووی موسوڵمانان وئوممەتانی ترە .

ج / قەدەغە کردنی واز لێهێنانی .

ئەم سێ خاڵەش نیشانەی بە هێزن و بەڵگەی ئاشکران ، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەو شتانە : دەبینین ئیمامی (**الحافظ ابن حجر**) لە (**فتح الباري**) دا : ( ٤ / ١٣٩ ) یەك دەنگی و کۆڕای زانایان ( واتە : **الإجماع** ) دەهێنێتەوە لەسەر سوننەت بوونی پارشێو ، خواش زاناترە .

## ئەو شتانەی کە پێویستە ڕۆژووان لێ ی دوور بکەوێتەوە :

بزانە ـ ئەی بەندەی سەرکەوتوو بۆ گوێڕایەڵی پەروەردگار پایە بەرز ـ کە ڕۆژووان ئەو کەسەیە ئەندامەکانی بە ڕۆژوو بن لە تاوان و زمانیشی لە درۆکردن و ووتەی پڕو پووچ و ناڕەوا ، وە خۆشی بگرێتەوە لە خواردن و خواردنەوەو جووت بوون لەگەڵ خێزانی ، ئەگەر قسەیشی کرد ووتەیەك ناڵێ روشێنەری ڕۆژووەکەی بێت ، وە کردەوەیەکیش ناکات ڕۆژووەکەی بەتاڵ بکاتەوە ، بەو شێوەیە دەبینین ووتە و کردەوەشی چاك دەبێت . ئەمەیە ئەو ڕۆژووەیەی کە خوای پەروەردگار و پێغەمبەرەکەی ﷺ لە موسوڵمانان دەیانەوێ ئەنجامی بدەن ، نەك تەنها خۆ گرتنەوە لە خواردن و

[٧٦] أخرجه البخاري : ( ٤ / ١٢٠ ) رقم : ( ١٩٢٣ ) ، ومسلم رقم : ( ١٠٩٥ ) عن أنس رضي الله عنه .

[٧٧] أخرجه مسلم رقم : ( ١٠٩٦ ) .

[٧٨] تقدم تخريجه في التعليقة رقم : ( ٧١ ) .

[٧٩] تقدم تخريجه ـــ أيضا ـــ في التعليقة رقم : ( ٧٣ ) .

خواردنەوە و ئارەزووەکان ، چونکە ڕۆژوو : ڕۆژوو گرتنی ئەندامەکانە لە تاوان و خۆگرتنەوەیە لە خواردن و خواردنەوە ، هەر وەکو چۆن خواردن و خواردنەوە ڕۆژوو بەتاڵ دەکاتەوە بەهەمان شێوە تاوانکردنیش پاداشتەکانی دەبڕێت و بەرهەمەکانی لەناو دەبات و وای لێ دەکات هاوشێوە بێ لەگەڵ ئەو کەسەی کە ڕۆژووی نەگرتووە . هەروەها دەبینین پێغەمبەر ﷺ موسوڵمانی ڕۆژووانی هانداوە خۆی بڕازێنێتەوە بە جوانترین و باشترین ڕەوشت و ، دوریش بکەوێتەوە لە ووتەی بێ نرخ و خراپ و هاوار کردن و درێژە دادڕی ، جا ئەگەر ئەم کردەوە خراپانەی کە قەدەغە کراون لەسەر موسوڵمانان لە ڕەمەزاندا و جگە لە ڕەمەزاندا داوایان لێ کراوە لێ یان دوور بکەونەوە لەهەموو کاتێکدا ، بەڵام قەدەغە کردنی لە ڕەمەزاندا و لە کاتی ئەنجامدانی فەرزی ڕۆژوودا زیاتر جەختی لەسەر کراوە .

بۆیە لە سەر هەموو موسوڵمانێکی ڕۆژووان پێویستە دوور بکەوێتەوە لە ئەو کردەوانەی ئەبنە هۆی ڕوشاندنی ڕۆژووەکەی بۆ ئەوەی سوود لە ڕۆژووەکەی وەربگرێت و هۆی لە خوا ترسانی بێ ، ئەو لە خوا ترسانەی کە خوای پەروەردگار باسی لێ وە دەکات و دەفەرمووێ : ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ [البقرة : ١٨٣].

چونکە ڕۆژوو ڕێگەیەکە بۆ لە خوا ترسان ، لەبەر ئەوەی ڕێگرە لە بەرامبەر (**نەفس**) بۆ زۆر لەو تاوانانەی کە (**نەفس**) ئەیەوێ ئەنجامی بدات ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ : " **الصَّوْمُ جُنَّةٌ** " [٨٠] ، لە پێشیشدا بە تێرو تەسەلی باسمان لێ وە کردووە لە بەشی ( **چاکەکانی ڕۆژوو** ) دا .

ئێستایش ـ **برای موسوڵمان** ـ ئەو کارە ناڕەوایانەت بۆ ئاشکرا دەکەین کە پێویستە بە ئاگا بێت لێیان بۆ ئەوەی فەرمان بە نەکردنیان بکەیت و خۆتیش بپارێزیت لەوەی بکەویتە داویانەوە ، خوایش لە شاعیر خۆش بێ کە دەفەرمووێ :

عرفت الشر لا للشرِّ لكن لتوقيه      ومن لم يعرف الشر من الخير يقع فيه

## ١ ـ ووتەی درۆ :

لە ( **أبو هريرة** ) وە رضي الله عنه دەگێڕنەوە فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " **مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ وَالعَمَلَ بِهِ فَلَيْسَ للهِ ـعزوجل ـ حَاجَةٌ أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَه** " [٨١] .

واتە : ئەگەر ڕۆژووان واز نەهێنێ لە ووتەی درۆ و کردەوەپێ کردنی ، خوای بەتواناو گەورە پێویستی بەوە نی‌یە واز لەخواردن و خواردنەوەکەی بێنێت .

---

[٨٠] تقدم تخريجه : في التعليقة رقم : (٨) .

[٨١] أخرجه البخاري : ( ٤ / ٩٩ ) رقم : ( ١٩٠٣ ) .

## ٢ ـ ووتەی پڕ و پوچ و بێ سود :

لە ( **أبو هريرة** ) وە ﷺ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : پێغەمبەر ﷺ فـەرمووی : " **لَيْسَ الصَّيامُ مِنْ الأَكلِ والشُّرْابِ ، إِنَّمَا الصَّيام مِن اللغْوِ وَ الرَّفَثِ ، فَإِنْ سَابَّكَ أحَدٌ أو جَهِلَ عَلَيْكَ فَقُلْ : إنّي صَـــائِمٌ** " [٨٢] .

واتـە : ڕۆژوو تـەنها خۆگرتنـەوە نیـە لـە خـواردن و خواردنـەوە ، بـەڵكو ڕۆژوو بریتـی یـە لـە خۆگرتنەوە لە ووتەی پڕوپوچ و بێ سوود ، وە ئەگەر هاتوو كەسێك جوێنی پێ دای یان نـەزانینێكی ( كردەوەیەكی نەفامانەی ) بەرامبەرت ئەنجامدا ( واتە : هەڵەیەكی بەرامبەرت كرد ) ئەوا پـێ بڵـێ : مـن بەڕۆژووم ، من بەڕۆژووم .

بۆیە دەبینین هەڕەشـەی توند لـە لایـەن پێغەمبـەرەوە ﷺ دراوە لـەو كەسـانەی ئـەم خراپانـە ئەنجام دەدەن ، پێغەمبەری ڕاستگۆ و بە ڕاست دانراو لەلایەن خواوە ، ئـەو پێغەمبـەرەی كـە بـەپێی ئارەزووەكانی هیچ ووتەیەك ناڵێ ، دەفەرمووێ : " **رُبَّ صَائِمٍ حَظُّهُ مِنْ صِيَامِهِ الجُوعُ وَالعَطَشْ** " [٨٣] .

واتە : زۆر ڕۆژووان هەیە تەنها برسێتی و تینویەتی بۆ دەمێنێتەوە . هۆكاری ئەوەش ئەوەیە ئەو كەسەی ئەو كردەوانە ئەنجام دەدات لە ڕاستی ڕۆژوو تێ نەگەشتووە كـە خـوای پـەروەردگار فـەرمانی پێ كردووە و سزایشی دەدات بەو كردەوانەی بەبێبەش كردنی لە ئەجر و پاداشتی ڕۆژووەكەی [٨٤] .

هەر لەبەر ئەوەشە زانایانی پێشینە پیاو چاكەكان (**سەلەفی ساڵح**) ی ئـەم ئوممەتـە جیاوازیـان كردووە لە نێوان قەدەغـە كردنێـك تایبـەت بـێ بـە خـودی پەرستنەكەوە و بـەتاڵی بكاتـەوە ، لەگـەڵ قەدەغە كردنێك تایبەت نەبێ بەخودی پەرستنەكەوەو بەتاڵی ناكاتەوە [٨٥].

## ئەو شتانەی كە حەڵاڵە بۆ ڕۆژووان :

هەر بەندەیەكی گوێڕیەڵ ئەگـەر تێگەیـشتبێ لـە قورئـانی پـیرۆز و سـوننەتەكانی پێغەمبـەر ﷺ گومانی نابێ كە خوای پەروەردگار ئەیەوێ كار ئاسان بكات لەسەر بەندەكانی و نایەوێ كاریان لەسـەر قورس بكات ، بۆیە ڕێگەی بە ڕۆژووان داوە چەند شتێك ئەنجام بدات ، و تـاوانی لـە سـەر هـەڵگرتووە ئەگەر هاتوو بەو كارانە هەستا ، **ئەو كارانەو بەڵگەكانی لەم خاڵانەی خوارەوە دەردەكەوێت :**

[٨٢] أخرجه ابن خزيمة رقم : ( ١٩٩٦ ) ، والحاكم : ( ١ / ٤٣٠ – ٤٣١ ) ، وسنده صحيح .

[٨٣] أخرجه ابن ماجه : ( ١ / ٥٣٩ ) ، والدارمي : ( ٢ / ٢١١ ) ، وأحمد : ( ٢ / ٤٤١ و ٢٧٣ ) ، والبيهقي : ( ٤ / ٢٧٠ ) من طريق سعيد المقبري من أبي هريرة ، وسنده صحيح .

[٨٤] وانظر ( اللؤلؤ والمرجبان فيما اتفق عليه الشيخان ) رقم : ( ٧٠٧ ) ، و ( رياض الصالحين ) رقم : ( ١٢١٥ ) .

[٨٥] راجع لهذا ( جامع العُلوم والـحِكَم ) ص : ( ٥٨ ) لابن رجب .

## ١ ـ ڕۆژووان دەتوانێ بە لەش گرانیەوە ڕۆژ بکاتەوە :

یەکێك لە کردەوەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەو بووە ، فەجری بەسەردا دەهات و لەشیشی گران بوو لە جووت بوونی لەگەڵ خێزانەکانی و خۆشوشتنی پاش فەجر ئەنجام دەدا و پاشان بە ڕۆژوو دەبوو .

لە ( **عائیشة** ) و ( **أم سلمة** ) وە ـ ڕەزای خوایان لێبێت ـ دەگێڕنەوە فەرموویانە : " أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُدْرِكُهُ الْفَجْرُ وَهَوُ جُنُبٌ مِنْ أَهلِهِ ، ثُمَّ يَغْتَسِلُ وَيَصُومُ " [٨٦].

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ جاری وا هەبوو فەجری بە سەردا دەهات بە لەش گرانی لە جووت بوونی لەگەڵ خێزانەکانی ، پاشان خۆی دەشوشت و بەڕۆژوو دەبوو .

## ٢ ـ سیواك کردن :

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ : " لَوْلا أنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتي لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّواكِ عِنْدَ كُلِّ وُضُوءٍ " [٨٧].

واتە : ئەگەر بهاتبایە و لەسەر ئومەتەکەم ناڕەحەت و قورس نەبوایە ، ئەوا فەرمانم پێ دەکردن لە کاتی هەموو دەستنوێژێك دا سیواك بکەن .

لێرەدا دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژووانی جیا نەکردووەتەوە لەو کەسەی کە بە ڕۆژوو نی‌یە ، ئەمەش بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە سیواك کردن بۆ هەموو کەسێك دروستە ڕۆژووان بێت یان نە لەکاتی هەموو دەستنوێژ و هەموو نوێژێکدا [٨٨] .

سیواك کردنیش لێرەدا ووتەیەکی گشتیە و کاتێکی بۆ دیاری نەکراوە ، بۆیە سیواك کردن دروستە پێش لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان و دوای ئەوەیش ( واتە : پێش نوێژی نیوەڕۆ و دوای ئەوەیش هەر دروستە ڕۆژووان سیواك بەکار بێنێت ) ۞ ، خواش زاناترە .

---

[٨٦] أخرجه البخاري : ( ٤ / ١٢٣ ) رقم : ( ١٩٢٧ ) ، و مسلم رقم : ( ١١٠٩ ) .

[٨٧] تنبيه : لقد وقع المؤلفان ــ حفظهم الباري من كل سوء ــ في وهم يسير في تخريج هذا الحديث ، حيث عزوا الحديث إلى صحيح مسلم ، والحديث بهذا اللفظ غير مخرج في مسلم ، وإنّما أخرجه البخاري تعليقاً ــ بصيغة الجزم ــ بهذا اللفظ عن أبي هريرة ، كما في (الفتح : ٤ / ١٨٨) ، وأخرجه ــ أيضاً ــ بهذا اللفظ الإمام أحمد في (مسنده) : (١٧١ / ٢٩٤ / ١) وابن ماجه في (سننه) رقم : (٥٣١٦) وصححيه (محدث الفقهاء وفقيه المحدثين في عصره) الإمام الألباني في (صحيح ابن ماجه) رقم : (٥٣١٦) ، أمّا لفظ مسلم : " لَوْلا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلاةٍ " فَتَنَبَّه .

[٨٨] ئەمەش بۆچوونی ئیمامی (**البخاري**) و (**ابن خزيمة**) و جگە لە مانیشە بڕوانە ئەم کتێبانە : (**فتح الباري**) : (٤ / ١٥٨) ، و (**صحيح ابن خزيمة**) : ( ٣ / ٢٤٧ ) ، و (**شرح السنة**) : (٦ / ٢٩٨ ) .

۞ **لە کتێبی** : ( نظم الفرائد مما في سلسلتي الألباني من فوائد ) : ( ١ / ٥٢٨ – ٥٢٩ ) : ( باب / مشروعية الإستياك للصائم في أي وقت شاء : **ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە** ، " كان يستاك آخر النهار **وهو صائم** " ، **و دەفەرمووێت** : ( **باطل** ) ە ( **الضعيفة** ، برقم : ٤٠٢ ) **پاشان سوودێك دەڵێت** :

## ٣ ـ ئاو ڕادانە ناو دەم و لووت :

چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوی ڕاداوە بە ناو دەم و لووتی دا کاتێك کە بە ڕۆژوو دەبوو ، بەڵام زیادەڕەوی ( **موبالەغەی** ) لەم دوو کارەدا قەدەغە ( **مەنع** ) کردووە لەسەر ڕۆژووان و فەرموویەتی : "... وَبَالِغْ في الإستِنْشَاقِ إلا أَنْ تَكُونَ صَائِماً " [٨٩] .

واتە : زیادەڕەوی و ( **موبالەغە** ) بکە لە ئاو وەڕادانە ناو لووت دا جگە لەو کاتەی کە بە ڕۆژوو دەبی .

## ٤ ـ ماچ کردن و دەست بازی بۆ ڕۆژووان :

سەلمێنراوە لە( **عائیشة** ) وە ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ کە فەرموویەتی : " كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُقَبِّلُ وَهُوَ صَائِمٌ وَيُبَاشِرُ وَهُوَ صَائِمٌ ، لَكِنَّه كَانَ أَمْلَكَكُمْ لإِرْبِهِ " [٩٠] .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ ماچی دەکرد لەکاتی بەڕۆژوو بوونی دا و دەسبازیشی لەگەڵ خێزانەکانیدا دەکرد لە کاتی بە ڕۆژوو بوونی دا ، بەڵام لە هەمووتان زیاتر توانای بە سەر خۆیدا هەبوو ، بەڵام : ئەم کارە (**مەکروهە**) بۆ لاوان و گەنجان جگە لە پیران :

( **عبد الله** ) ی کوڕی ( **عمرو** ) ی کوڕی ( **العاص** ) ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی : " كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَجَاءَ شَابٌ ، فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللهِ أُقَبِّلُ وأنا صَائِمٌ ؟ قَالَ : لا ، فَجَاءَ شَيْخٌ فَقَالَ : أُقَبِّلُ وأنا صَائِمٌ ؟ قَالَ : نَعَم ، قَالَ : فَنَظَرَ بَعْضُنَا إلى بَعْضٍ ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : إنَّ الشَّيخَ يَمْلِكُ نَفْسَهُ " [٩١].

---

**سوودێك :** ويغني عن هذا الحديث في مشروعية السواك للصائم في أي وقت شاء أول النهار أو آخر عموم قوله ﷺ : " **لولا أن أشق على أمتي ، لأمرهم بالسواك عند كل صلاة** " متفق عليه ، وهو مخرج في ( الإرواء ، رقم : ٧٠ ) . وما أحسن ما روى الطبراني في (الكبير :٢٠ / ٧٠ / ١٣٣) ، وفي ( مسند الشاميين:٢٢٥٠ ) بإسناد يحتمل التحسين عن عبد الرحمن بن غنم قال : " **سالت مغاذ بن جبل : أتسوك وأنا صائم ؟ قال : إن رسول الله ﷺ قال : لخلوف الصائم أطيب عند الله من ريح المسك ؟ فقال : سبحان الله ! لقد أمرهم بالسواك ، وهو يعلم أنه لا بد أن يكون بفي الصائم خلوف وإن استاك ، وما كان بالذي يأمرهم أن ينتنوا أفواههم عمداً ، ما في ذلك من الخير شيء ، بل فيه شر ، إلا من ابتلي ببلاء لا يجد منه بداً . قلت : والغبار في سبيل الله أيضا كذلك : إنما يؤجر من اضطر إليه ، ولا يجد عنه محيصا ؟ قال : نعم ، فأما من ألقى نفسه في البلاء عمداً ، فما له في ذلك من أجر** " . وقال الحافظ في ( التلخيص : ص ١٩٣ ) : " إسناده جيد " . ثم قال الزيلعي : " ويدخل فيه أيضا من تكلف الدوران ، وكثرة المشي إلى المساجد ، بالنسبة إلى قوله ﷺ : " **وكثرة الخطا إلى المساجد** " ، ومن يصنع في طلوع الشيب في شعره بالنسبة إلى قوله ﷺ : " **من شاب شيبة في الإسلام** " : إنما يؤجر عليها من بلي بهما " ) ا . هـ .

[٨٩] أخرجه الترمذي : (٣ / ١٤٦) ، وأبو داود : (٢ / ٣٠٨) ، وأحمد : (٤ / ٣٢) ، وابن أبي شيبة : (٣ / ١٠١) ، وابن ماجه رقم : ( ٤٠٧ ) ، والنسائي رقم : ( ٨٧ ) عن لقيط بن صبرة ، وسنده صحيح .

[٩٠] أخرجه البخاري : ( ٤ / ١٣١ ) رقم : ( ١٩٢٧ ) ، ومسلم رقم : ( ١١٠٦ ) .

[٩١] أخرجه أحمد : ( ٤ / ١٨٥ و ٢٢١ ) من طريق ابن لهيعة ، عن يزيد بن أبي حبيب ، عن قيصر التجيبي عنه ، و سنده ضعيف ، لضعف ابن لهيعة . وله شاهد أخرجه الطبراني في ( الكبير ) رقم : ( ١١٠٤٠ ) من طريق حبيب بن أبي ثابت ، عن مجاهد ، عن ابن عباس ، و حبيب مدلس ، وقد عنعنه . فهو به حسن ، و يراجع له ــ لزاما ــ ( الفقيه و المتفقه ) ص : ( ١٩٢ ــ ١٩٣ ) ، فإن له طرقا أخرى .

واتە : لاوێك هات و پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ماچی خێزانەکەم بکەم لە کاتی بە ڕۆژوو بوونم ؟ فەرمووی : نەخێر ، پاشان پیاوێکی پیر هات و پرسی : ئەی پێغەمبەری خوا ماچی خێزانەکەم بکەم لە کاتی بە ڕۆژوو بوونم ؟ فەرمووی : بەڵێ . ( **عبد الله** ) فەرمووی : ئێمەش هەندێکمان سەیری هەندێکی ترمانی کرد ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : پیاوی پیر توانای بەسەر خۆیدا هەیە .

## ٥ ـ تاقی کردنەوەی ( تەحلیل کردنی ) خوێن و دەرزی لێ دانێك مەبەست لێ ی خواردن پێدان نەبێت [٩٢] :

چونکە هیچ لەم کردەوانە ڕۆژوو بەتاڵ ناکاتەوە .

## ٦ ـ کەڵەشاخ کردن ( الحجامة ) :

یەکێك بوو لەو شتانەی کە ڕۆژووی بەتاڵ دەکردەوە ، پاشان (**نەسخ**) کرایەوە ، ئەوەشمان پێگەیشتووە کە پێغەمبەر ﷺ ئەو کارەی ئەنجام داوە لەکاتی بە ڕۆژوو بوونی .

لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە ( **ابن عباس** ) رضي الله عنه دەیگێڕێتەوە : " أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ احتَجَمَ وَهُوَ صَائِمٌ " [٩٣] .

واتە : پێغەمبەری خوا کەڵە شاخی کردووە لە کاتی بە ڕۆژووو بوونیدا.

## ٧ ـ چێژ (تام) کردنی خواردەمەنی (ذوق الطعام) :

بەڵام ئەم کارە بە مەرجێك ئەبێ خواردنەکەی نەڕواتە قورگەوەوە ، لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە ( ابن عباس ) رضي الله عنه دەیگێڕێتەوە : " لا بَأسَ أنْ يَذُوقَ الخَلَّ أو الشَّيءَ مَا لَم يَدْخُلُ حَلْقَهُ وَهُوَ صَائِمٌ " [٩٤] .

واتە : ڕۆژووان هیچی لە سەر نیە ئەگەر چێژ (تام) ی سرکە یان هەر شتێکی تر بکات بە مەرجێك نەڕواتە قورگێوە ، لە کاتی بە ڕۆژوو بونیدا .

---

[٩٢] انظر : (رسالتان موجزتان في الزكاة والصيام) ص : ( ٢٣ ) للشيخ عبدالعزيز بن باز .

[٩٣] أخرجه البخاري : ( ٤ / ١٥٥ ) رقم : ١٩٣٨ . وانظر : ( ناسخ الحديث و منسوخه ) ص : ( ٣٣٤ ــ ٣٣٨ ) لابن شاهين .

[٩٤] علقه البخاري : ( ٤ / ١٥٤ ) . ووصله ابن أبي شيبة ( ٣ / ٤٧ ) ، والبيهقي : ( ٤ / ٢٦١ ) من طريقين عنه ، وهو حسن وانظر : ( تغليق التعليق ) : ( ٣ / ١٥١ ــ ١٥٢ ) .

## ٨ ـ كل ( سورمە ) کردن و قەترە و هاوشێوەکانی لەو شتانەی کە دەکرێتە چاوەوە :

ئەو شتانە هیچیان ڕۆژوو بەتاڵ ناکەنەوە ، با ئەو کەسەش ئەنجامی دەدات هەست بە چێژ ( **تام** ) ەکەی لەدەم دا بکات . ئەم بۆچوونەش بۆچونی ( **شيخ الإسلام ابن تيمية** ) ەیە لە کتێبە بە سودەکەی ( **حقيقة الصيام** ) هەروەها بۆ چوونی ( **ابن القيم** ) ی قوتابیەتی لە کتێبە بە نرخەکەی ( **زاد المعاد** ) .

ئیمامی (**البخاري**) یش لە (**صحيح**) ە کەیدا هەمان بۆچوونی هەیە و دەفەرمووێت : (( **ولم يرَ أنس** رضي الله عنه ، **والحسن ، وإبراهيم ، بالكحل باساً** )) (٩٥).

واتە : ئەنەس رضي الله عنه و حەسەنی بەصری و إبراهیم بۆچوونیان وایە : کە چاو ڕەشتن بە کل (**سورمە**) هیچی تێدا نیە بۆ ڕۆژووان .

## ٩ ـ ئاوی سارد کردن بە سەر سەردا و خۆشۆردن :

ئیمامی ( **البخاري** ) لە( **صحيح** ) ە کەیدا لە بەشی ( **باب اغتسال الصام** ) دەفەرمووێت : (( وَبَلَّ (٩٦) ابن عمر ـ رضي الله عنهما ـ ثوبا فالقاه عليه وهو صائم ، و دخل الشعبي الحمام وهو صائم ، و قال الحسن : لا باس بالمضمضة والتبرد للصائم )) (٩٧).

واتە : ( **ابن عمر** ) رضي الله عنه لە کاتی بەڕۆژوو بوونیدا جلێك لە جلەکانی خۆی تەڕ دەکرد وخۆی پێ دادەپۆشی ، وە ( **الشعبي** ) دەڕۆیشتە حەمامەوە لە کاتی بەڕۆژوو بوونیدا ، وە ( **الحسن** ) یش دەیفەرموو : هیچی تێدا نیە ئەگەر ڕۆژووان ئاو هەڵداتە دەم و خۆشی فێنك بکاتەوە .

پێغەمبەری خوایش صلى الله عليه وسلم لە کاتی بە ڕۆژوو بوونی دا لە تاو تینوێتی و گەرمادا ئاوی دەکرد بەسەر سەریدا (٩٨) .

---

(٩٥) فتح الباري : ( ٤ / ١٥٣ ) . قارنه بـ ( مختصر صحيح البخاري ) رقم : ( ٤٥١ ) لشيخنا الألباني ، و ( تغليق التعليق ) : ( ٣ / ١٥٢ ــ ١٥٣ ) .

(٩٦) **واتە : ئاوی بە سەردا دەپرژاند بۆ فێنك بوونەوە لە بەر تینویەتی بە ڕۆژوو بوونی .**

(٩٧) انظر المصادر السابقة .

(٩٨) أخرجه أبو داود رقم : (٢٣٦٥) ، وأحمد : (٥ / ٣٧٦ ، ٣٨٠ ، ٤٠٨ ، ٤٣٠) ، وسنده صحيح .

# خوا ئەیەوێ کارتان لەسەر ئاسان بکاتەوە و نایەوێت لەسەرتانی قورس بکات :

## ١ / بۆ ڕێبواران ( المسافر ) :

زۆر فەرموودەی (**صحیح**) مان پێگەیشتووە دەربارەی ئەوەی کە ڕۆژووان ڕێی پێ دراوە بە هەڵ بژاردن لە نێوان ئەوەی کە بە ڕۆژوو بێت یان بە ڕۆژوو نەبێت لە کاتی ڕێبواری ( **سەفەر** ) دا ، ئەوەشمان لەیاد نەچێ کە ئەم میهرەبانیە خواوەندیە لە قورئانی پیرۆزیشدا باسکراوە خوای میهرەبان و بەبەزەیی دەفەرمووێ : ﴿ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ [البقرة : ١٨٥] .

واتە : هەریەکێك لە ئێوە نەخۆش بوو یان ڕێبوار و لە سەفەردا بوو ، بۆی ڕەوایە بە ڕۆژوو نەبیت ، بەڵام پاش ئەو نەخۆشی و ڕێبواریە پێویستە بە ژمارەی ئەو ڕۆژانە قەزای ڕۆژووەکەی بکاتەوە ، خوای پەروەردگار لەم فەرمانەیدا ئەیەوێت کارتان لەسەر ئاسان بکاتەوە و نایەوێ لەسەرتانی قورس بکاتەوە .

( **حمزة** ) ی کوڕی ( **عمرو الأسلمي** ) ﷛ پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و فەرمووی : ئایا ڕۆژوو بگرم لە کاتی ڕێبواری و سەفەردا ؟ زۆریش بەڕۆژوو دەبوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو : **" صُمْ إنْ شِئْتَ وَافطِرْ شِئْتَ "** (٩٩).

واتە : بەویستی خۆت ، ئەگەر ویستت بەڕۆژوو بە ، و ئەگەر نا بە ڕۆژوو مەبە.

وە لە ( **أنس** ) ی کوڕی ( **مالك** ) ەوە ﷛ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : **" سَافَرْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ في رَمَضَان ، فَلَمْ يَعِب الصَّائِمُ عَلَى الُمفْطِرِ وَلا الُمفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ "** (١٠٠).

واتە : لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا لە گەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ سەفرم کرد ، لەم سەفەرەدا ئەوانەی بە ڕۆژوو بوون لۆمەی ئەوانەیان نەکرد کە بە ڕۆژوو نەبوون ، هەروەها ئەوانەش کە بە ڕۆژوو نەبوون لۆمەی ئەوانەیان نەدەکرد کە بە ڕۆژوو بوون .

(٩٩) أخرجه البخاري : ( ٤ / ١٥٦ ) رقم : ( ١٩٤٣ ) ، و مسلم رقم ( ١١٢١ ) .
(١٠٠) أخرجه البخاري : ( ٤ / ١٦٣ ) رقم : ( ١٩٤٧ ) ، ومسلم رقم : ( ١١١٨ ) .

ئەم هەموو فەرموودانە ئەوە دەگەیەنن کە ڕۆژووانان بە ویستی خۆیان بوون بەڕۆژوو بن یان نە ، بێ ئەوەی کە یەکێکیان گرتن یان نەگرتن بە باشتر بزانێت ، بەڵام ئەتوانرێت بەڵگە بەهەندێ فەرموودەی گشتی بۆ ئەوەی بهێنرێتەوە کە ڕۆژوو نەگرتن باشترە لە کاتی سەفەردا لە گرتنی .

وەکو ئەو فەرموودەیەی پێغمبەری خوا ﷺ کە دەفەرمووێ : " إِنَّ اللهَ يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ ، كَمَا يَكْرَهُ أَنْ تُؤْتَى مَعْصِيَتُهُ " (١٠١) .

واتە : خوای پەروەردگار پێی خۆشە ڕێپێدانەکانی ( ڕوخسەتەکانی ) وەربگیرێت ، هەروەکو چۆن پێی ناخۆشە تاوانی بەرامبەر بکرێت .

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە : " كَمَا أَنْ تُؤْتَى عَزَائِمُهُ " (١٠٢) .

واتە : **هە**روەکو چۆن پێی خۆشە عەزیمەتاکانی وەربگرێت .

بەڵام پێویستە ئەم ووتانە تایبەت بکرێت بە کەسانێك کە هیچ ناڕەحەتیەکیان لە سەر نیە لە کاتی قەزا کردن و جێ بەجێ کردنیشدا ، بۆ ئەوەی ڕێپێدانەکەی لەسەر پێچەوانە نەبێتەوە بە پێچەوانەی مەبەست ، ئەم فەرموودەیەش کە لە ( **أبو سعيد الخدري** )ەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە ئەم ووتەیە ڕوون دەکاتەوە بە باشترین شێوە ، فەرموودەکەش : " وَكَانُوا يَرَوْنَ أَنَّهُ مَنْ وَجَدَ قُوَّةً فَصَامَ فَحَسَنٌ ، وَمَنْ وَجَدَ ضَعْفًا فَأَفْطَرَ فَحَسَنٌ " (١٠٣) .

واتە : هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیان بە باش دەزانی ئەگەر کەسێك بە هێز بێت و توانای ڕۆژووی هەبێ لە سەفەردا ، با بە ڕۆژوو بێت و کارێکی چاکی ئەنجام داوە . و ئەو کەسەش لاواز بێت و توانای ڕۆژووی نەبێت لە سەفەردا ، با بە ڕۆژوو نەبێ و کارێکی چاکی ئەنجام داوە .

ئەوەش بزانە ـ **برای باوەڕدارم** ـ خوای پەروەردگار ڕێنیشاندەرت بێ بۆ ڕێگەی سەرفرازی و هیدایەت و لەخوا ترسان و ڕۆزیشت بدات لە فێربوونی ئایین . کە ڕۆژوو لە سەفەردا چاکەکاری نیە ئەگەر ڕۆژوو گرتنەکەی ڕۆژووان ناڕەحەت بکات ، بەڵکو ڕۆژوو شکاندن لەو کاتەدا و لای خوای پەروەردگایش خۆشەویست ترە ، بەڵگەش لە سەر ئەم ووتەیە ئەو فەرموودەیەیە کە لە زۆر هاوەڵانی پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : " لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ " (١٠٤) .

---

(١٠١) أخرجه أحمد : ( ٢ / ١٠٨ ) ، وابن حبان رقم : ( ٢٧٤٢ ) عن ابن عمر بسند صحيح .

(١٠٢) أخرجه ابن حبان رقم : ( ٣٥٤ ) ، والبزار رقم : ( ٩٩٠ ) ، والطبراني في (الكبير) رقم : (١١٨٨١) عن ابن عباس بسند صحيح . وفي الحديث ـــ بلفظيه ـــ كلام طويل ليس هنا موضع بسطه .

(١٠٣) أخرجه الترمذي رقم : ( ١٧٦٣ ) عنه ، وسنده صحيح . وإن كان فيه الجريري ، فرواية الأعلى عنه من أصح الروايات كما قال العجلي وغيره .

(١٠٤) أخرجه البخاري : ( ٤ / ١٦١ ) رقم : ( ١٩٤٦ ) ، ومسلم رقم : ( ١١١٥ ) عن جابر رضي الله عنه .

واتە: ڕۆژوو گرتن لە سەفەردا لە چاکەکاریەکان نیە .

**بیرخستنەوەیەك :** لەوانەیە هەندێ کەس گومانیان وابێت کە بەڕۆژوو نەبوون لەم سەردەمەی خۆماندا لەکاتی سەفەردا ڕەوا نیە ، و ڕەخنەش بگرن لەو کەسەی ڕێپێدانی خوای پەروەردگار وەردەگرێ لەم کاتەدا ، یان ئەڵێن : ڕۆژوو گرتن باشترە بەهۆی ئاسان بوونەوەی گواستنەوە و زۆر بوونی ، ئەو جۆرە کەسانە ئەو ووتەیەی خوای پەروەردگاری زانا بە پەنهانی و ئاشکراکانیان بیردەخەینەوە کە دەفەرمووێ : ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴾ [مريم : ٦٤] ، واتە : پەروەردگاری تۆ هەرگیز شتی لە بیر نەچووە و نا چێتەوە ، هەروەها دەفەرمووێ : ﴿ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾ [البقرة : ٢٣٢] ، وە ئەویشیان بیر دەخەینەوە کە لەو ئایەتەدا هاتووە . باس لە ڕێپێدانی ڕۆژوشکاندن دەکات لە کاتی سەفەردا . کە دەفەرمووێ : ﴿ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ ﴾ [البقرة : ١٨٥] .

واتە : خوا ئەیەوێت کارتان لەسەر ئاسان بکات و نایەوێ لەسەرتانی قورس بکاتەوە .

کەواتە : ئاسانکردن و سوکردنەوە لەسەر ڕێبوار کردارێکە ویستی خوای پەروەردگارە و یەکێکیشە لە مەبەستەکانی ئاینی ئیسلامی پیرۆز سەرەڕای ئەوەی کە ئەم ئایینەی دارشتووە بەدیهێنەری کات و شوێن و مرۆڤیشە ، هەر ئەویشە زاناترین کەس بە پێویستیەکانی ئەو کارانەش چاکیان دەکات و ئەو شتانەش بۆیان چاکە ، خوای پەروەردگار دەفەرمووێ : ﴿ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ﴾ [الملك : ١١٤] .

باسکردنی ئەم شتانە بۆ ئەوەیە کە موسوڵمانان بە ئاگا بن کە ئەگەر خوای پەروەردگار و پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمانێکیان پێدا ، بۆ هیچ موسڵمانێك نیە ووتەی خۆی بە باشتر بزانێت لە ووتەی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ ، بەڵکو پێویستە لەگەڵ بەندە گوێڕایەڵەکانی خوای پەروەردگار دا کە ووتەی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ ناخەن بلێ : ﴿ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ﴾ [البقرة : ١٨٥] .

واتە : گوێبیستی ووتەکانین و گوێڕایەڵین بۆیان ، جا خوایە لە تاوانەکانمان خۆشبە و گەڕانەوەشمان هەر بۆ لای تۆیە .

## ٢ ـ بۆ نەخۆشان :

خوای پەروەردگار بە میهرەبانێتی خۆی ڕۆژوو شکاندنی بۆ نەخۆش بە ڕەوا داناوە ، ئەوەش ئاسانکردنەوەیەکە بۆیان ، ئەو نەخۆشیەش کە ڕەوایە ڕۆژووی تێدا بشکێنرێت ئەو نەخۆشیەیە کە لە

گەڵ ڕۆژوودا ئەبێتە هۆی زیان لە مرۆڤدا یان زیاد بوونی هۆکارەکانی نەخۆشیەکە ، یان بەبوونی ڕۆژوو چاکبوونەوەی نەخۆشیەکە دوا دەکەوێ ، خواش زاناترە .

## ٣ ـ بۆ ئەو ئافرەتانەی کە لە بێنوێژین یان زەیسانیدا ۞ :

زانایان کۆڕان لەسەر ئەوەی کە ڕۆژوو قەدەغەیە لەسەر ئەو ئافرەتانەی کە لەبێ نوێژیدا یان لە زەیسانیدان ، وە پێویستە بە ڕۆژوو نەبن ، بەڵام پاشان ڕۆژووەکەیان قەزا دەکەنەوە ، بەڵکو ئەگەر بێتوو لەو کاتەیاندا بە ڕۆژوو بن ڕۆژووەکەیان پوچەڵە و فەرزەکەیان لەسەر ناکەوێ " ڕوونکردنەوەی ئەمەش " بەویستی خوا لە لاپەڕەی : ( ) دا دەبێت .

## ٤ ـ بۆ پیاو ئافرەتی بەتەمەن :

( **ابن عباس** ) ـ ڕەزای خوا لە هەردووکیان بێت ـ فەرموویەتی : " الشَّيْخُ الكَبيرُ وَالمَرْأةُ الكَبيرةُ لا يَسْتَطيعانِ أنْ يَصُومَا ، فَيُطْعِمَا مَكَانَ كُلَّ يَوْمٍ مَسْكِيْنَاً " [١٠٥] .

واتە : پیاو و ئافرەتی بەتەمەن کە توانای ڕۆژوو گرتنیان نیە با بەرامبەر بەهەر ڕۆژێك لە ڕۆژووەکەیان نانی هەژارێك بدەن ، ئیمامی (**الدارقطني**) یش : ( ٢ / ٢٠٧ ) ئەم فەرموودەیە دەگرێتەوە بە (**صحيح**) یشی دادەنێ لە ڕێگەی ( **منصور** ) لە ( **مجاهد** ) لە ( **ابن عباس** ) ەوە کاتێك ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾ فەرمووی : " هُوَ الشَّيْخُ الَّذي لا يَسْتَطيعُ الصِّيامَ فَيُفْطِر ، وَيُطْعِمْ عَنْ كُلِّ يَوْمٍ مَسْكِيناً ، نِصْفُ صَاعٍ مِنْ حَنْطَة " [١٠٦] .

واتە : مەبەستی ئایەتەکە ئەو پیاوە بە تەمەنانە دەگرێتەوە کە توانای ڕۆژوو گرتنیان نیە ، ئەو کەسانە بەڕۆژوو نابن و بەرامبەر بە هەر ڕۆژێك لە ڕۆژووەکەی خواردنی هەژارێك دەدات ، ئەویش بریتی یە لە نیو (**صاع**) لە گەنم ، هەر ( **صاع** ) ێك بریتی یە لە چوار گوێل گەنم ، کەواتە ، نیوەی (**صاع**) ێك دوو گوێل گەنمە .

وە لە ( **أبو هريرة** ) وە ﷺ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : (( مَنْ أدْرَكَهُ الكِبَرُ فَلَمْ يَسْتَطِعْ أنْ يَصُومَ رَمَضَان ، فَعَلَيْهِ لِكُلِّ يَوْمٍ مُدٌّ مِنْ قَمْح )) [١٠٧].

---

۞ زەیسانی ، واتە : خوێنی دوای منداڵ بوون .

[١٠٥] أخرجه البخاري رقم : (٤٥٠٥) . وانظر ( شرح السنة ) : ( ٦ / ٣١٦ ) ، و (فتح الباري) : (٨ / ١٨٠) ، و (نيل الأوطار) : ( ٤ / ٣١٥ ) ، و (إرواء الغليل) : (٤ / ٢٢ ــ ٢٥) . وقد نقل في (الإجماع) رقم : ( ١٢٩ ) : الإجماع على ذلك .

[١٠٦] انظر التعليق السابق نفسه .

[١٠٧] أخرجه الدارقني : (٢ / ٢٠٨) وفي سنده عبدالله بن صالح ، وهو ضعيف ، لكن له شواهد .

واتە : هەر کەسێ گەشتە تەمەنی پیری و نەیتوانی بە ڕۆژوو بێت لە ڕەمەزاندا لە سەری پێویستە بەرامبەر بەهەر ڕۆژێك کە بەڕۆژوو نابێت گوێلێك گەنم ببەخشێت .

وە لە ( **أنس** ) ی کوڕی ( **مالك** ) ەوە رضي الله عنه : (( أَنَّهُ ضَعُفَ عَنِ الصَّوْمِ عَامًا ، فَصَنَعَ جَفْنَةَ ثَرِيدٍ وَدَعَا ثَلاثِينَ مَسْكِينًا ، فَأَشْبَعَهُم )) [١٠٨] .

واتە : (**أنس**) رضي الله عنه ساڵێك لە ساڵەکانی تەمەنی نەی دەتوانی بە ڕۆژوو بێت بەهۆی پیریەوە ، لەو کاتەدا قازانێکی زۆر گەورەی تریتی دروست کردوو سی هەژاری بۆ ئەو خواردنە میوانداریێتی کرد و هەموویانی تێر کرد .

## ٥ ـ بۆ ئافرەتی سك پڕو شیردەر :

یەکێك لە میهرەبانیەکانی خوای پەروەردگار بەرامبەر بە بەندە لاوازەکانی ئەوەیە کە بۆی ڕەوا کردوون بە ڕۆژوو نەبن ، لەو کەسانەش کە ئەم ڕێپێدانەیان بەر ئەکەوێ ئافرەتی سك پڕو شیردەرە .

لە (**أنس**)ی کوڕی (**مالك**) ەوە رضي الله عنه [١٠٩] ەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی : " غَارَتْ عَلَيْنَا خَيْلُ رَسُولِ اللهِ ﷺ ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَوَجَدْتُهُ يَتَغَدَّى ، فَقَالَ : أُدْنُ فَكُلْ " فَقُلْتُ : إِنِّي صَائِمٌ ، فَقَالَ : " أُدْنُ أُحَدِّثْكَ عَنِ الصَّوْمِ ، أو الصِّيامِ . إنَّ اللهَ تَبَارَكَ وتَعالى وَضَعَ عَنِ الْمُسَافِرِ شَطْرَ الصَّلاةِ ، وَعَنِ الحَامِلِ والْمُرْضِعِ الصَّوْمَ ، أو الصِّيامَ " ، واللهِ لَقَدْ قَالَهُمَا النَّبِيُّ ﷺ كلَيْهِمَا أو أَحَدُهُمَا فَيَا لَهفَ نَفْسِي ألا أكُون طَعِمْتُ طَعَامَ النَّبِيِّ ﷺ [١١٠] .

واتـە : سـوار چاکەکانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ هێرشـیان هێنایـە سـەرمان ، لـەو کاتـەدا هاتمـە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بینیم خـەریکی خواردنـە ، پێـی فـەرمووم : وەرە پێـشەوە خـواردنم لـە گەڵدا بخۆ ، منیش ووتم : من بە ڕۆژووم ، پاشان فـەرمووی : وەرە پێـشەوە باسـی ڕۆژوو ـ یـان ڕۆژوو گرتن ـ ت بۆ بکەم خوای پەروەردگار و پایە بەرز نیوەی نوێژی لەسەر ڕێبـواران لابـردووە ، وە لەسـەر ئـافرەتی سك پـڕو شـیردەریش ڕۆژووی لابـردووە . پاشـان ( **أنـس** ) دەفـەرمووێت : سـوێند بـەخوای پەروەردگار پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم دوو شتەی فەرموو هەردووکیان یان یەکێکیان ، بەڵام بـەڵام ئـای چەند پەرۆشم و پەشیمانم خواردنەکەی پێغەمبەرم نەخوارد ﷺ .

---

[١٠٨] أخرجه الدارقني : ( ٢ / ٢٠٧ ) وسنده صحيح .

[١٠٩] وهو الكعبي ، لا أنس ابن مالك الانصاري ، خادم رسول الله ﷺ ، وإنما هذا رجل من بني عبدالله بن كعب ، وقد نزل البصرة ، وروى عن النبي ﷺ حديثا واحدا فقط ، وهو هذا الحديث . انظر (الإصابة) : (١ / ١١٤ ــ ١١٥) لابن حجر ، و ( تجريد أسماء الصحابة ) : ( ١ / ٣١ ) للذهبي ، وقارن مع ( فيض القدير ) : ( ٢ / ٢٦٨ ) فبينهما فروق دقيقة !

[١١٠] أخرجه الترمذي رقم : (٧١٥) ، النسائي : (٤ / ١٨٠) ، وأبو داود رقم : (٧١٥) ، والنسائي : (٤ /١٨٠) ، وأبو داود رقم ( ٢٤٠٨ ) وابن ماجه رقم : ( ١٦٦٧ ) ، وسنده حسن كما قال الترمذي .

# بەربانگ کردن ( الإفطار ) :

## ١ ـ ڕۆژووان کەی بەربانگ دەکات ؟

خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ ﴾ ، پێغەمبەری خـواش ﷺ ئـەوەی بۆ ڕاڤە و تەفسیر کردووین بە هاتنی شەو و پشت هـەڵکردنی ڕۆژ لـە گـەڵ نـەمانی بازنـەی خـۆر لـە گـەڵ ئاسـۆدا ، لـە باسـەکانی پێشوشدا ئەوەنـدە باسمـان لێـوە کـردووە دڵـی موسـوڵمانانی شـوێنکەوتوی سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ ئارام بگرێت لە وەرگرتنی جا ئەی بەندەی خوا ، ئەمە ووتەی پێغەمبـەری خوایە ﷺ لە بـەر دەسـتتدایە و خوێندوتنـەوە و حاڵەتەکانیـشی شـاراوە نـین لـە لات و دەیانزانیـت ، کردەوەی هاوەڵکانیش ﷺ بەچاوی خۆت دەبینی ، کە چۆن شوێنی ئـەو سـونەتانە کـەوتوون هـەنگاو بە هەنگاو .

لە (**عمر**)ی کوڕی (**میمون الأودی**)یەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە فەرموویـەتی : " **كَانَ أصْحَابُ مُحَمَّدٍ ﷺ أَسْرَعَ النَّاسِ إِفْطَاراً وَأَبْطَأَهُم سُحُوراً** " [١١١] .

واتە : هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە هەموو خەڵکی خێراتر بوون لە بەربانگ کردن و لە هەمووشـیان خاوتر بوون لە دواخستنی پاشێودا .

## ٢ ـ پەلەکردن لە بەربانگ دا :

جا ئەی برای باوەڕدار ، هەوڵی بەربانگ کردن بـدە کـە خـۆر ئـاوا بـووو ، پەنـدیش لـە وەدا نیـە سوراییەکی تۆخ لە ئاسۆدا مابێت ، چونکە ئەو کارەت شوێنکەوتنی سـوننەتەکانی پێغەمبـەری خوایـە ﷺ ، وە پێـچەوانە کردنـی جولەکـە و گـاور ( **خـاچ پەرسـت** ) ەکانـە ، چـونکە جولەکـە و گاورەکـان بەربانگ دوا دەخەن بۆ کاتێکی دور و درێـژ بەشـێوەیەك تـاکو ئەسـتێرە لـە ئاسمانـدا دەردەکـەوێت ، ئەوەش بزانە شوێنکەوتنی ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ و دواکەوتنی سوننەتەکانی دەرخستنی دروشمـەکانی ئایینە ، وە شانازی کردنە بەو هیدایەتەی کە موسڵمانانی لە سەرە ، داواکـارین لـە خـوای پـەروەردگار هەموو مرۆڤ و جنۆکەشی لە سەر کۆ بکاتەوە .

فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ لەم برگانەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە کە :

### أ / پەلە کردن لە بەربـانگ دا هۆکـارێکە بۆ چاکە :

---

[١١١] أخرجه عبدالرزاق في ( المصنف ) رقم : ( ٧٥٩١ ) بإسناد صحيحة الحافظ في ( الفتح ) : ( ٤ / ١٩٩ ) ، والهيثمي في ( مجمع الزوائد ) : ( ٣ / ١٥٤ ) .

لە (**سهيل**)ی کوڕی (**سعد**)ەوە ﷺ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ :" **لايَزالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الفِطْرَ** " [112] .

واتە : بەردەوام خەڵکی لە چاکەدان ، تا ئەو کاتەی پەلە لە بەربانگیاندا دەکەن .

## ب / پەلە کردن لە بەربانگ سوننەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ :

ئەگەر ئومەتی ئیسلامی پەلە بکات لە بەربانگی دا ، ئەوا لەسەر سوننەتی پێغەمبەر ﷺ مانەتەوە و هان لەسەر ڕێبازی پێشینە پیاوچاکانی ئەم ئوممەتە ، وە هەرگیز گومڕا نابن ـ بەویستی خوا ـ تا ئەو کاتەی دانیان پێوە گرتووە بە کاکیلەکان ، یان ئەوەش ڕەت دەکەنەوە کە ببێتە هۆی گۆڕینی ئەو بنەوایانە .

هەروەها لە ( **سهل** ) ی کوڕی ( **سعد** ) ەوە ﷺ دەفەرمووێ : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " **لا تَزَالُ أُمَّتِي عَلَى سُنَّتِي مَا لَم تَنْتَظِرُ بِفِطْرِهَا النُّجُومَ** " [113] .

واتە : بەردەوام ئومەتەکەم لەسەر سوننەتی منن تا ئەو کاتەی بەربانگیان دوا نەخەن بۆ کاتی دەرکەوتنی ئەستێرەکان .

## ج / پەلە کردن لە بەربانگ کارکردنە بە پێچەوانەی جولەکە و گاورەکان :

ئەگەر خەڵکی لە چاکەدا بن لەبەر ئەوەی ڕێبازی پێغەمبەرەکەیان گرتبێتە بەرو پارێزگاریان لەسەر سوننەتەکانی کردبێت ، کەواتە ئاینی ئیسلام بە ئاشکرایی و بەتوانایی ئەمێنێتەوە هیچ زیانێکی پێ ناگات لەلایەن ئەو کەسانەوە کە پێچەوانەی دەبن ، لەو کاتەشدا ئوممەتی ئیسلامی وەکو چرایەکی ڕووناك دەبێت لە تاریکی شەوە زەنگ دا دەدرەوشێتەوە و پێشەوایەکی چاکیش دەبێ بۆ لاسای کردنی ، چونکە ئەو کاتە نابێتە کلك و شوێنکەوتەی هیچ ئوممەتێکی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواش ، و ناشبێتە سێبەرەی هیچ بانگەوازێك لەگەڵ بادا بێت و بڕوات .

لە ( **أبو هريرة** ) وە ﷺ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : پێغەمبەی خوا ﷺ دەفەرمووێت : " **لا يَزَالُ الدِّينُ ظَاهِراً مَا عَجَّلَ النَّاسُ الفِطْرَ ، لأنَّ اليَهُودَ وَالنَّصَارَى يُؤَخِّرُونَ** " [114] .

---

[112] أخرجه البخاري : ( ٤ / ١٧٣ ) رقم ( ١٩٥٧ ) ، ومسلم رقم : ( ١٠٩٣ ) .

[113] أخرجه ابن حبان رقم : ( ٨٩١ ) بسند صحيح . وأصله كما تقدم في ( الصحيحين ) .

**دەڵێین :** کرداری ( **شیعەی دوانزە ئیمامی** ) لە گەڵ کرداری جولەکە و گاور ( **خاچ پەرستان** ) دا یەك دەگرنەوە لە دواخستنی بەربانگ کردن تا کاتی دەرکەوتنی ئەستێرە . خوای گەورە پەنای هەموومان بدات لە گومڕایی یان و بمان پارێزێت .

[114] أخرجه أبو داود : ( ٢ / ٣٠٥ ) ، وابن حبان رقم : ( ٢٢٤ ) وسنده حسن .

واتە : بەردەوام ئایینی ئیسلام ئاشكرا و سەركەوتووە بەسەر هەموو ئایینەكان تا ئەو كاتەی كە خەڵكی پەلە بكەن لە بەرانگ كردنیاندا چونكە جولەكە گاورەكان بەربانگ دوا دەخەن . لەو كۆمەڵە فەرموودانەی كە باسكران كۆمەڵێك سوود و پەندیان لێ بەدی دەكرێت ، ئەوەش بەم پێیەی خوارەوە :

**یەكەم :** مانەوەی ئیسلام و شەكاندنی ئاڵاكەی بە شێوەیەكی ئاشكرا ، بەستراوە بە پێچەوانە كردنی ئەو ئوممەتانەی كە لە پێش ئیسلام دا هەبوون و هەن لەوانەی كە كتێبی ئاسمانیان بۆ نێردراوە ( **أهل الكتاب** ) ، وە لەوەشدا ئەوە ئاشكرا دەبێ بۆ ئوممەتی ئیسلامی كە لە خێردا دەبێ ئەگەر هاتوو ئوممەتێكی خواوەندی ( **ڕەبانی** ) و جیاواز بوو ، واتە نە ڕۆژهەڵاتی و نەش ڕۆژئاوایی بن ، وە ئەوەش ڕەت بكەنەوە كە لە ئاسمانی ( **كرملن** ) دا بسوڕێنەوە ، یان ئارامی و خۆشیان دەسكەوێت لە باخچەكانی ( **كۆشكی سپی** ) دا ـ خوای پەروەردگار ڕەشی بەسەردا برێـژێت ـ ، یان ڕوویان وەربگێڕن بەرەو ( **لندن** ) ـ خوای پەروەردگار بیكات بە كەلاوە و چۆڵەوانی ـ ئەگەر ئەو شتانەی كرد ئەو كاتە وەكو خاڵێكی درەوشا و دەمێنێتەوە لەناو ئوممەتاندا و هەموو خەڵكی چاوی لێ دەبێ ، دڵەكانیش ڕووی تێ دەكەن ، ئەمەش هەرگیز نابێت جگە لەو كاتە نەبێت كە ئەگەڕێتەوە بۆ لای قورئانی پیرۆز و سوننەتەكانی پێغەمبەر ﷺ لە بیرو باوەڕ و پرۆگرامیشدا .

**دووەم :** پابەند بوون بە ئیسلام دەبێ پابەند بوون بێ بەوردوو درشتی ئیسلام ، بەڵگەش ووتەی خوای پەروەردگارە كە دەفەرمووێ : ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ ادْخُلُواْ فِي السِّلْمِ كَآفَّةً﴾ [البقرة : ٢٠٨] ، واتە : ئەی ئەو كەسانەی كە باوەڕدارن ئایینی ئیسلام وەرگرن بە گشتی .

لەسەر ئەم بنەوایەش دابەشكردنی ئایین بۆ ناوەڕك و ڕوكەش بیدعەیە و تازەگەریەكی نەفامانەی سەردەمە ، مەبەست لێی تێكدانی بیری موسوڵمانانە و موسوڵمانان دەخاتە گێژاوەی گرنگی دان بە هەندێك شت كە هیچ بنەوایەكی نیە لە ئایینی ئیسلامدا ، بەڵكو ڕەگەكەی درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە سەر ئەو كۆمەڵەی كە خوای پەروەردگار غەزەبی لێ گرتن و تووڕە بوو لێیان ( واتە : **جولەكەكان** ) ئەوانەی كە باوەڕیان بە بەشێك لە كتێبەكەیان هەبوو كوفریشیان بە بەشەكەی تری دەكرد ، ئەوانەی فەرمانمان پێ كراوە پێچەوانەیان بین لە وردوو درشتماندا ، ئەوەشت زانی كە بەرهەمی پێچەوانە بوونی جولوكە و گاورەكان مانەوەی ئایینە بە ئاشكرا و بە دەسەڵات دارێتی .

**سێیەم :** بانگەواز كردن بۆ لای خوای پەروەردگار و بیرخستنەوەی باوەڕداران ، بنەواكانیان لە یەكتر جیا نابێتەوە ، وە ئەو ڕوداوە گەورانەی كە هاتۆتە سەر ئوممەتی ئیسلامی وامان لێ ناكات جیاوازی بكەین لە نێوان دروشمەكانی خوای پەروەردگار ، واشمان لێ ناكات بە شێكی بە باشتر بزانین

لە بەشەکەی تری ، بە مەبەستی بە کەم زانینی هەندێك لەو بەشانە وە بڵێین هەروەکو زۆر کەس هەن دەڵێن : ئەم شتانەی ڕوکەشین و لاوکین و خیلافین و هان لە پەراوێزی بابەتەکان وپێویستە وازیان لێ بێنین و تواناکنمان یەکخەین لەسەر بابەتە سەرەکیەکان کە هۆکاری تێکدانی ڕیزی موسوڵمانانن و پەرش و بڵاوی کردووین ! !

کەواتە ، ئەی موسوڵمانی بانگەوازکار بۆ لای خوای پەروەدگار لەسەر بینایی و زانست . ئەوەت زانی لەم فەرموودە پیرۆزانەوە کە مانەوەی ئایین بە ئاشکرایی بەستراوە بە پەلەکردن لە بەربانگ کردن و ئەوەش بە ئاوا بوونی بازنەی خۆر دەبێت ، جا با لە خوای پەروەردگار بترسن ئەو کەسانەی گومانی ئەوە دەکەن کە بەربانگ کردن لە کاتی ئاوابوونی بازنەی خۆر هۆی ئاشوبە ، وە بانگەواز کردن بۆ زیندو کردنەوەی ئەم سوننەتە بانگەوازە بۆ گومڕایی و نەزانین و دور خستنەوەی موسوڵمانان لە ئاینەکەیان ، یان ئەو کارە بانگەشەیە کە هیچ نرخێکی نیە و هەرگیز موسوڵمانانی لەسەر کۆ نابێتەوە ، چونکە بەشێکە لە کردەوە لاوەکیە خیلافیەکان یان بەشێکە لە ڕوکەش ! ! وە ( لا حول ولا قوة إلا بالله ) .

### د / بەربانگ پێش نوێژی مەغریب دەکرێت :

پێغەمبەری خوا ﷺ بەر بانگی دەکرد پێش ئەوەی نوێژی مەغریب ئەنجام بدات [(١١٥)] ، چونکە پەلە کردن لە بەربانگ لە ڕەوشتی پێغەمبەرانە ، لە ( **أبو الدرداء** ) ەوە ﷺ فەرموویەتی " ثَلاثٌ مِنْ أَخْلاقِ النُّبُوةِ : تَعْجيلُ الإفطارِ ، وَتَأخيرُ السُّحُورِ ، وَوَضْعُ اليَمينِ عَلَي الشِّمالِ في الصَّلاةِ " [(١١٦)].

واتە : سێ ڕەوشت لە ڕەوشتی پێغەمبەرانە : پەلە کردن لە بەربانگ دا ، وە دواخستنی پارشێو ، وە دانانی دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ لە نوێژدا .

### ٣ / ڕۆژووان بە چی بەربانگ دەکاتەوە ؟

پێغەمبەری خوا ﷺ هانی ڕۆژووانان دەدات بە خورما بەربانگ بکەن ، ئەگەر خورمایان دەست نەکەوت بە ئاو ، ئەمەش لە تەواوی بەزەیی و سور بوونیەتی ﷺ لەسەر ئوممەتەکەی و ئامۆژگاری کردنیان .

پەروەردگاری هەموو عالەم ئەو زاتەی ( **محمد** )ی ﷺ ناردووە ، وەك ڕەحمەتێك بۆ خەڵك دەفەرمووێ : ﴿ لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ

---

(١١٥) أخرجه أحمد : ( ٣ / ١٦٤ ) ، وأبو داود رقم : ( ٢٣٥٦ ) عن أنس ﷺ بسند حسن .

(١١٦) أخرجه الطبراني في ( الكبير ) ــ كما في ( المجمع ) : ( ٢ / ١٠٥ ) ــ وقال : (... مرفوعا وموقوفا ، والموقوف صحيح والمرفوع فيه رجاله من لم أجد من ترجمة ) . قلنا : والموقوف ــ كما هو ظاهر ــ له حكم الرفع أيضا .

﴾ [التوبة : ١٢٨] ، چونكە بە پێدانی شتێكی شیرین بەلەش لەكاتی بەتاڵ بوونی گەدە ، زیاتر وای لێ دەكات ئەو خواردنە وەربگرێت و ئەندامەكانی سودی لێ وەربگرن ، بە تایبەت لەشی ساغ ، پێی بەهێز دەبێت بەڵام سەبارەت بە ئاو : لەبەر ئەوەی لەش تووشی جۆرێك لە ووشكی دەبێت بەهۆی ڕۆژووەوە ، ئەگەر بە ئاو تەڕ بێت زیاتر سوود وەردەگرێت لە خواردنەكە .

ئەوەش بزانە ئەی بەندەی گوێڕایەڵ كە خورما بەرەكەت و تایبەتمەندی هەیە . هەروەها ئاویش . لە كاركردنە سەر دڵەكان و پاك كردنەوەیان ، ئەوەش جگە لەو كەسانە نەبێ كە شوێن كەوتووی سوننەتن كەسی تر نایزانێت .

لە ( **أنس** ) ی كوڕی ( **مالك** ) ەوە رضي الله عنه دەگێڕنەوە دەفەرمووێ : **" كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُفْطِرُ عَلَي رَطِابَاتٍ قَبْلَ أنْ يُصَلي ، فَإنْ لم يَكُنْ رَطِابَاتٍ ، فَتَمْرات ، فَإنْ لم يَكُنْ تَمْرَاتٍ حَسَا حَسَواتٍ مِنْ مَاء "** [١١٧] .

واتە : پێغەمبەر ﷺ بەر بانگی دەكرد بە چەند خورمایەكی تەڕ پێش ئەوەی نوێژ بكات ، جا ئەگەر خورمای تەڕ نەبووایە ، بە هەر خورمایەكی تر بەربانگی دەكرد ، بەڵام ئەگەر خورمای هەر دەست نەكەوتبایە چەند قومێك ئاوی دەخواردەوە .

## ٤ / ڕۆژووان چی دەڵێن لە كاتی بەربانگ كردندا ؟

برای ڕۆژووان بزانە - خوای پەروەردگار ئێمە و تۆش سەركەوتوو بكات بۆ شوێنكەوتنی سوننەتەكانی پێغەمبەركەمان ﷺ - كە پاڕانەوەیەكت بۆ هەیە و وەڵامیش دەدرێتەوە ، جا بە دەستی بێنە وەكو هەلێك ، بشپاڕێرەوە و دڵنیابە بە وەڵام دانەوەی ، ئەوەش بزانە خوای پەروەردگار وەڵامی پاڕانەوەی دڵی بێ ئاگا و دڵ ڕۆیشتوو ناداتەوە ، وە لێی بپاڕێرەوە ئەوەی ئەتەوێ لە پاڕانەوەی چاك ، بەڵكو چاكەی دونیا و دواڕۆژیشت بە دەست بێنی .

لە (**أبو هريرة**) وە رضي الله عنه دەگێڕنەوە فەرموویەتی : پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ : **" ثَلاثُ دَعَواتٍ مُسْتَجَابَاتٍ : دَعْوَةُ الصَّائِمِ ، وَدَعْوَةُ المَظْلُومِ ، وَدَعْوَةُ المُسَافِرِ "** [١١٨].

واتە : سێ پاڕانەوە هەن وەڵام دەدرێنەوە : پاڕانەوەی ڕۆژووان و پاڕانەوەی ستەم لێكرووا و پاڕانەوەی ڕێبوار.

---

[١١٧] أخرجه أحمد : ( ٣ / ١٦٣ ) ، وأبو داود : ( ٢ / ٣٠٦ ) ، و ابن خزيمة : ( ٣ / ٢٧٧ ــ ٢٧٨ ) ، والترمذي : ( ٣ / ٧٠ ) من طريقين عن أنس رضي الله عنه ، وسنده صحيح .

[١١٨] أخرجه العقيلي في (الضعفاء) : (٧٢/١) ، وأبو مسلم الكَّجي في (جزئ) ومن طريقه ابن ماسي في (جزء الأنصاري) : (ق٩/ب) وسنده صحيح له لا عنعنة يحيى ابن أبي كثير . وله شاهد : وهو الآتي بعده .

ئەو پاڕانەوەی کە ڕەت ناکرێتەوە لە کاتی بەربانگ دایە لەبەر فەرموودەی (**أبو هريرة**) ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە دەفەرمووێ : " **ثَلاثٌ لا تُرَدُّ دَعْوَتَهُم : الصَّائِمُ حِيْنَ يُفْطِرُ ، وَالإِمَامُ العَادِلُ ، وَدَعْوَةُ المَظْلُومِ** " [١١٩] .

واتە : سێ کەس پاڕانەوەکانیان ڕەت ناکرێتەوە : ڕۆژووان لە کاتی بەربانگ کردنیاندا ، و پێشەوای دادپەروەر ، و پاڕانەوەی ستەم لێکراو .

وە لە ( **عبد الله** ) ی کوڕی ( **عمر** ) ی کوڕی ( **عاص**) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " **إِنَّ لِلصَّائِمِ عِنْدَ فِطْرِهِ لَدَعْوَةٌ مَا تُرَدُّ** " [١٢٠] .

واتە : ڕۆژووان لە کاتی بەربانگیدا پاڕانەوەیەکی هەیە ، هەرگیز ڕەت ناگرێتەوە .

وە باشترین پاڕانەوەش ، ئەو پاڕانەوەیە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ

لە کاتی بەربانگ دا دەیفەرموو : " ذَهَبَ الظَّمَأُ وَابْتَلَّت العُرُوقُ ، وَثَبَتَ الأَجْرُ إِنْ شَاءَ اللهُ " [١٢١] .

واتە : تیونوێتی نەما قورگ تەڕ بوو ، پاشان پاداشتیشمان جێگیر بوو بەویستی خوا .

## ٥ / خواردن پێدانی ڕۆژووان :

برای خۆم ـ خوای پەروەردگار بەرەکەتی خۆیت بە سەردا برێژێت و سەرکەوتووت کات بۆ کاری چاکە و لە خواترسان ـ سوربە لەسەر ئەوەی کە خواردن بدەی بە ڕۆژووانان ، لەبەر ئەو پاداشتە گەورەیەی کە لەو کارەدا هەیە ، لەبەر ئەو چاکە زۆر و فراوانەی کە تێدایە .

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : " **مَنْ فَطَّرَ صَائِماً كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ ، غَيْرَ أَنَّهُ لا يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِ الصَّائِمِ شَيْئاً** " [١٢٢] .

واتە : هەر کەسێ خواردن بدات بە ڕۆژووانێك لە کاتی بەربانگ دا ، وەکو پاداشتی ئەو ڕۆژووانەی دەست دەکەوێت بێ ئەوەی لە پاداشتی ڕۆژووانەکەی کەم بێتەوە .

وە ئەگەر ڕۆژووان میوان دارێتی کرا پێویستە لەسەری وەڵامی میوان داریەتەکە بداتەوە ، چونکە ئەو کەسەی وەڵامی میوان داریەتەکە نەداتەوە سەرپێچی لە فەرمانی ( **أبو قاسم** ) کردووە ﷺ ، وە

(١١٩) أخرجه الترمذي رقم : ( ٢٥٢٨ ) ، وابن ماجه رقم : ( ١٧٥٢ ) ، وابن حبان رقم : ( ٢٤٠٧ ) . وفيه جهالة أبي مدله .

(١٢٠) أخرجه ابن ماجه : (١/ ٥٥٧) ، والحاكم : (١ / ٤٢٢) ، وابن السني رقم : (١٢٨) ، والطيالسي رقم : ( ٢٩٩ ) من طريقين عنه . وقال البوصري ( ٢ / ٨١ ) : ( هذا إسناد صحيح رجاله ثقات ... ) .

(١٢١) أخرجه أبو داود : (٣٠٦/٢) ، والبيهقي : (٢٣٩/٤) ، والحاكم : (٤٢٢/١) ، وابن السني رقم : (١٢٨) والنسائي في (عمل اليوم والليلة) رقم : (٢٦٩) ، والبيهقي : (١٨٥/٢) وقال : (إسناده حسن).قلنا : وهو كما قال.

(١٢٢) أخرجه أحمد : ( ٤ / ١١٤ - ١١٥ و ١١٦ ) و ( ٥ / ١٩٢ ) ، والترمذي رقم : ( ٨٠٤ ) ، وابن ماجه رقم ( ١٧٤٦ ) ، وابن حبان رقم : ( ٨٩٥ ) ، وصحيحه الترمذي . وهو كما قال .

پێویستە باوەڕی وابێت ئەو میواندارێتیە هیچ لە حەسەناتەکانی وون ناکات و هیچیش لە پاداشتی کەم ناکاتەوە .

وە سوننەتیشە میوان بپاڕێتەوە لە خوا بۆ خاوەن ماڵ ، دوای واز هێنان لە خواردن ، بەو پاڕانەوانەی کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ پێمان گەیشتووە ، ئەوەش چەند جۆرێکە لە وانەش فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەفەرمووێ :

أ / " أَكَلَ طَعَامُكُمُ الأَبْرَارُ ، وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ المَلائِكَةُ ، وَأَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ " [١٢٣] .

واتە : پیاو چاکان خواردنتان بخۆن و فریشتەکانی خواش صەڵاواتتان لەسەر بدەن ( واتە : بۆتان بپاڕێنەوە ) و ڕۆژووانیش لە لاتان بەربانگ بکات .

ب / " اللهُمَّ أَطْعِمْ مَنْ أَطْعَمَنِي ، وَاسْقِ مَنْ سَقَانِي " [١٢٤] .

واتە : خوایە خواردن بدە بەو کەسەی خواردنی پێداوم وئاویش بدە بەو کەسەی ئاوی پێ دام .

ج / " اللهُمَّ اغْفَرْ لَهُمْ وَارْحَمْهُمْ وَبَارِكْ لَهُم فِيْمَا رَزَقْتَهُمْ " [١٢٥] .

واتە : خوایە لە تاوانەکانیان خۆش بەو ڕەحمیان پێ بکە و بەرەکەتیش بخەرە ڕۆزیانەوە.

## بەتاڵکەرەوەکانی ڕۆژوو :

زۆر شت هەن پێویستە ڕۆژووان لێیان دوور بکەوێتەوە ، چونکە ئەگەر ئەو شتانە لە ڕۆژانی ڕەمەزان دا ئەنجام بدات ڕۆژووەکەی بەتاڵ دەبێتەوە و تاوانەکانی زۆر دەبن ، ئەو شتانە ئەمانەن :

### ١ ـ خواردن و خواردنەوە بە ئەنقەست :

خوای پایە بەرز دەفەرمووێ : ﴿ وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ﴾ [البقرة : ١٨٧] ، لەم ئایەتەوە تێدەگەین کە ڕۆژوو گرتن خۆگرتنەوەیە لە خواردن و خواردنەوە ، واتە : ئەگەر ڕۆژووان خواردن و خواردنەوە بخوات ڕۆژووەکەی بەتاڵ دەکاتەوە .

ئەمەش تایبەتە بە کەسێك ئەو کارە ئەنجام بدات بە ئەنقەست ، چونکە ڕۆژووان ئەگەر لە کاتی لەبیر چوون یان بەهەڵە و ناڕازی پێی کرا ، لەو کاتەدا هیچی لەسەر نیە .

---

[١٢٣] أخرجه ابن أبي شيبة : ( ٣ / ١٠٠ ) ، وأحمد : ( ٣ / ١١٨ ) ، والنسائي في (عمل اليوم و الليلة) رقم : (٢٦٨) ، وابن السني رقم : (١٢٩) ، وعبد الرزاق : (٤ / ٣١١) من طريق عنه . وسنده صحيح .

تنبيه : فما يزيده بعضهم في هذا الحديث : " **وذكركم الله في من عنده** " . مما لا أصل له هنا ، فتأمل .

[١٢٤] أخرجه مسلم رقم : (٢٠٥٥) عن المقداد .

[١٢٥] أخرجه مسلم رقم : (٢٠٤٢) عن عبد الله بن بسر .

ئەمانەش بەڵگەن لەسەر ئەو ووتەیە :

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفـەرمووێ : " إِذَا نَسِيَ فَأَكَلَ أو شَرِبَ فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللهُ وَسَقَاهُ " [١٢٦] .

واتــە : ئەگــەر ڕۆژووان لــە بـیری چــوو کــە بــە ڕۆژووە و خــواردن و خواردنــەوەی خــوارد ، بـا ڕۆژووەکەی تەواو بکات ، ئەو کەسە خوای پەروەردگار خواردن و خواردنەوەی پێ داوە .

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفـەرمووێ : " إِنَّ اللهَ وَضَعَ عَنْ أُمَّتِي الخَطَأَ وَالنِّسْيَانَ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ " [١٢٧] .

واتە : خوای پەروەردگار قەڵەمی تاوانی لەسەر ئومەتەکەم هەڵگرتووە ، ئەگەر هەڵـە بکـەن یـان لە بیریان بچێتەوە یان کارێکیان بە زۆر پێ بکرێت بێ ڕەزامەندی خۆیان .

## ٢ ـ خۆڕشانەوەی بە ئەنقەست :

چونکە ئەو کەسەی ڕشانەوە زۆری پێ هێنا و ڕشایەوە هیچی لەسەر نیە .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویـەتی : " مَنْ ذَرَعَهُ الْقَيءُ فَلَيْسَ عَلَيْهِ قَضَاءٌ ، وَمَنْ اسْتَقَاءَ فَلْيَقْضِ " [١٢٨] .

واتە : هەر کەسێ ڕشانەوە زۆری پێ هێنا و ڕشایەوە قەزای ڕۆژووی لەسەر نىیە ، بەڵام کەسێك بە ئەنقەست خۆی ڕشانەوە با قەزای ڕۆژووەکەی بکاتەوە .

## ٣ ـ بێ نوێژی و زەیستانی :

ئەگەر ئافرەت بێ نوێژی و زەیستانی بەسەردا هات لە کاتی بە ڕۆژووبونـدا ـ سـەرەتای ڕۆژ بێـت یان کۆتای ـ ڕۆژووەکەی دەشکێنێت و نابێ بەردەوام بێ ، چونکە ڕۆژووی ئەو ڕۆژەی لەسەر ناکـەوێت ئەگەر بە ڕۆژوویش بێ .

پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی : " أَلَيْسَ إِذَا حَاضَتْ لَمْ تُصَلِّ ، وَتُفْطِرُ فِي رَمَـــضَان ، فَهَـــذَا نُقْصَانُ دِيْنِهَا " [١٢٩] .

---

[١٢٦] أخرجه البخاري : ( ٤ / ١٣٥ ) رقم : ( ١٩٣٣ ) ، ومسلم رقم : ( ١١٥٥ ) .

[١٢٧] أخرجه الطحاوي في ( شرح معاني الآثار ) : ( ٢ / ٥٦ ) ، والحاكم : ( ٢ / ١٩٨ ) ، و ابن حزم في ( الإحكام ) : ( ٥ / ١٤٩ ) ، والـدارقطني : ( ٤ / ١٧١ ) من طريقين عن الأوزاعي عن عطاء بن أبي رباح ، عن عبيد بن عمير ، عن ابن عباس ، وسنده صحيح .

[١٢٨] واتە : زۆری پێهێنا .

واتە : ئایا ئافرەت کە کەوتە بێنوێژیەوە واز لە نوێژ و ڕۆژوویش ناهێنێت ؟ فەرموویان : بەڵێ ، فەرمووی : ئەوەیە کەمی ئایینەکەی .

وە لە ڕیوایەتێکی تردا : چەندەها شەو دەمێنێتەوە نوێژ ناکات و ڕۆژووش ناگرێت لە ڕەمەزان دا ئەوەیە کەمی ئایینەکەی [١٣٠] .

فەرمانی قەزا کردنەوەشی - واتە : ڕۆژووش لە فەرموودەیەك دا لە ( **معاذة** ) وە هاتووە کە دەفەرمووێ : " پرسیارم لە ( **عائيشة** ) کرد و ووتم : بۆ چی ئافرەت لە دوای بێ نوێژی دا قەزای ڕۆژووەکەی دەکاتەوە و قەزای نوێژەکانی ناکاتەوە ؟ فەرمووی : ئایا تۆ ( **حەروری** ) [١٣١] ت ؟!

ووتم : نەخێر من ( **حەوری** ) نیم ، بەڵام تەنها پرسیار دەکەم ، فەرمووی : لەسەر دەمی پێغەمبەردا ﷺ دەکەوتینە بێنوێژیەوە فەرمانمان پێ دەکرا قەزای ڕۆژەکانمان بکەینەوە و فەرمانی قەزاکردنەوەی نوێژمان پێ نەدەکرا [١٣٢] .

## ٤ـ دەرزی لێدانێك مەبەست پێی خواردن پێدان بێت ( الحقن الغذائية ) :

ئەمەش بریتی یە لە گەیاندنی هەندێ شتی خواردەمەنی بۆ گەدە بە مەبەستی خواردن پێدانی هەندێك لە نەخۆشەکان ، ئەم جۆرەش ڕۆژووی ڕۆژووان بەتاڵ دەکاتەوە ، چونکە ئەم خواردنە دەکرێتە ناو لەشەوە [١٣٣] ، بەڵام ئەگەر دەرزیەکە نە دەگەیشتە گەدە بەڵام دەکرایە خوێنەوە ، ئەمەشیان هەمان حوکمی هەیە چونکە جێگەی خواردن پێدان و خواردنەوە دەگرێتەوە ، چونکە چەندین نەخۆش بە هۆی ئەم جۆرە دەرزیانەوە لە کاتی بێ ئاگایی و لە هۆش خۆ چووندا خواردنیان پێ دەدرێت ، وەکو : ( **گلوکۆز** ) و ( **سلاین**

---

(١٢٩) أخرجه أبو داود : (٢/٣١٠) ، والترمذي : (٣/٧٩) ، وابن ماجه : (١/٥٣٦) ، وأحمد : (٢/ ٤٩٨) من طريق هشام بن حسان ، عن محمد بن سيرين عن أبي هريرة ، وسنده صحيح كما قال شيخ الإسلام في ( حقيقة الصيام ) ص : ( ١٤ ) .

(١٣٠) أخرجه مسلم رقم : ( ٧٩ ) و ( ٨٠ ) عن ابن عمر و عن أبي هريرة .

(١٣١) الحروی : نیسبەتە بۆ لای ( **حروراء** ) شارێکە نزیکەی دوو ( **میل** ) دوورە لە شاری (**الكوفة**) وە ، بەو کەسەیش بیر و باوەڕی ( **خەوارج** ) ی هەبێت ئەوترێت : (**حەروری**) چونکە یەکەم کۆمەڵی ( **خەوارج** ) لەم جێگایەوە سەری هەڵداوە دژ بە ـ خەلیفەی پێغەمبەری خوا ﷺ ـ ( **علي** ) رضي الله عنه ، بۆیە نیسبەت دەدرێنە پاڵ ئەم شارە . ئەمە ووتەی ئیمامی ( **الحافظ بن حجر** ) ە لە کتێبی : ( **فتح الباري** ) دا : ( ٤ / ٤٢٤ ) . وە بڕوانە : (**اللباب** ) : ( ١ / ٣٥٩ ) ی ( **ابن كثير** ) . =

ئەو (**حەروریانە**) : وا پێویست دەکەن لەسەر ئافرەت ئەگەر پاك بووەوە لە بێنوێژی قەزای ئەو نوێژانەی بکاتەوە کە لە کاتی بێنوێژیەکەیدا لە دەستی چوون بۆیە (**عائيشة**) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەوە ترسا کە (**معاذة**) پرسیارەکەی لە (**خەوارج**)ەوە وەرگرتبێت ، ئەو کۆمەڵەی هەموو کاتێ بە بۆچوونەکانیان ڕەخنەیان لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ دەگرت ، یان بە پێوانەکانیان (**الأقيسة**) ، نمونەشیان لەم ڕۆژگارەمان دا زۆرە !!! وە بڕوانە بەشی : (**التوثيق عن الله ورسوله**) لە کتێبی : ( **دراسات منهجية في العقيدة السلفية** ) دانانی : **سليم الهلالي** .

(١٣٢) أخرجه البخاري : ( ٤ / ٤٢٩ ) رقم ( ٣٢١ ) ، ومسلم رقم : ( ٣٣٥ ) .

(١٣٣) انظر ( حقيقة الصيام ) ص : ( ٥٥ ) لشيخ الإسلام ابن تيمية .

) ، هەروەها ئەو کەسانەی کە تووشی تەنگە نەفەسی سنگ بوون ، هەندێ شتیان دەدرێتێ ، بەهەمان شێوە ڕۆژووەکەیان بەتاڵ دەکاتەوە .

**٥ ـ جووت بوون لەگەڵ خێزان دا :**

ئیمامی ( **الشوكاني** ) لە کتێبی : ( **الدراي المضية** ) دا : ( ٢ / ٢٢ ) فەرموویەتی : ( جووت بوون لە گەڵ خێزان دار ڕۆژوو بەتاڵ دەکاتەوە ئەگەر کەسێك ئەنجامی بدات بە ئەنقەستەوە ، بەڵام ئەگەر لە کاتی لە بیر چووندا ئەنجام بدرێت ، هەندێك لە زانایان دەیخەنە ڕیزی ئەو کەسەی خواردن و خواردنەوەی خواردبێت لە کاتی لە بیر چوون دا ) .

هەروەها ئیمامی ( **ابن القيم** ) لە کتێبی : ( **زاد المعاد** ) دا : ( ٢ / ٦٠ ) فەرموویەتی : (( بەڵگەی قورئان لەسەر ئەوەیە کە جووت بوون لەگەڵ خێزان دا ڕۆژوو بەتاڵ دەکاتەوە ، هەر وەکو چۆن خواردن و خواردنەوە ڕۆژوو بە تاڵ دەکەنەوە ، خیلافیش لەوەدا نیە )) .

بەڵگەکەشی لە قورئانی پیرۆزدا ئەم ئایەتەیە : ﴿ فَالآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ ﴾ [سورة البقرة : ١٨٧] ، لەم ئایەتەدا خوای پەروەردگار ڕێدەدات بە جووت بوون لەگەڵ خێزاندا .

ئەوەشمان بۆ دەر دەکەوێت کە ڕۆژوو گرتن خۆگرتنەوەیە لە جووت بوون لەگەڵ خێزاندا و خواردن و خواردنەوە ، وە هەر کەسێك ڕۆژووەکەی بە تاڵ بکاتەوە بە جووت بوون لەگەڵ خێزاندا ، پێویستە لەسەر ڕۆژووەکەی قەزا بکاتەوە و کەفارەتیش بدات ، بەڵگەش لەسەر ئەمە فەرموودەی (**أبو هريرة**) یە ﷺ کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت : " **أَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ : يَا رَسُولَ الله هَلَكْتُ ؟ قَالَ : وَمَا أَهْلَكَكَ ؟ قَالَ : وَقَعْتُ عَلَي امْرَأَتِي فِي رَمَضَانَ ، قَالَ : هَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَعْتِقَ رَقَبَةً ؟ قَالَ : لا ، قَالَ : هَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ ؟ قَالَ : لا ، قَالَ: فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تُطْعِمُ سِتِّينَ مِسْكِينَا ؟ قَالَ : لا قَالَ : اجْلِسْ ، فَجَلَسَ ، فَأُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بعَرَق فيه تَمْرٌ ، قَالَ : تَصَدَّقْ به ، قَالَ : مَا بَيْنَ لابَتَيْهَا أَحَدٌ أَفْقَرَ مِنَّا ، قَالَ : فَضَحِكَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَى بَدَتْ أَنْيَابُهُ ، قَالَ : خُذْهُ فَأَطْعِمْهُ أَهْلَكَ** " [١٣٤].

واتە : پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و پێی فەرموو : تیاچووم ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەویش پێی فەرموو : چی لە ناوی بردیت ؟ فەرمووی : لەگەڵ خێزانەکەمدا جووت بووم لە مانگی ڕەمەزاندا ، فەرمووی : ئایا دەتوانیت کۆیلەیەك ڕزگار بکەیت ؟ فەرمووی : نەخێر ، فەرمووی : ئایا دەتوانیت دوو مانگ لە سەر یەك بە ڕۆژوو بیت ؟ فەرمووی : نەخێر ، فەرمووی : ئایا دەتوانیت

---

(١٣٤) ثبت الحديث بألفاظ مختلفة عن البخاري : (٥١٦/١١) رقم : (٦٧٠٩) و (١٩٣٦) ، ومسلم رقم : (١١١١) ، والترمذي رقم : (٧٢٤) ، والبغوي : (٢٨٨/٦) ، وأبي داود رقم : (٢٣٩٠) ، والدارمي : (١١/٢) ، وابن ماجه رقم : (١٦٧١) ، وابن أبي شيبة : (١٨٣/٢ ــ ١٨٤) ، وابن خزيمة : (٣ /٢١٦) ، وابن الجارود رقم : (١٣٩) ، والشافعي رقم : (٢٩٩) ، ومالك : (١ / ٢٩٧) ، وعبدالرزاق : (٤ / ١٩٦) . وأرسله بعضهم ، ووصله جلهم ، وصحت عند بعضهم زيادة : " **اقضي يوما مكانه** " وقد صححها الحافظ ابن حجر في (الفتح) : (٥١٦/١١) ، وهو كما قال ، **والعرق** : زنبيل منسوج من بسائح الخوص . **واتە : زەمبیلێکی چنراو لە شوڵی دار.**

خواردنی شەست هەژار بدەیت ؟ فەرمووی : نەخێر ، فەرمووی باشە دانیشە و چاوەڕێ بکە ، ئەویش دانیشت ، لەو کاتەدا سەبەتەیەك خورمایان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەم خورمایە بەرەو بیکە بەخێر ، فەرمووی : لە نێوان ئەم پەڕو ئەو پەڕی ئەم شارەدا کەسێکی تر نیە لە ئێمە هەژارتر بێت ، (**أبو هريرة**) رضي الله عنه دەفەرمووێت : پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی تا دانەکانی دەرکەوت و فەرمووی : بیبە ، بە خواردنی خێزانەکەتی دە .

## قەزا کردنەوە :

**١ ـ** موسوڵمانی خواناس ـ خوای پەروەردگار زانستی شەرعیمان فێرکات ـ بزانە کە قەزاکردنەوەی لە دەست چووەکانی ڕەمەزان پێویست نىیە ڕاستەوخۆ پاش ڕەمەزان بێ ، بەڵکو پێویستە لە سەرخۆ بێ پەلە کردن بێ ، لە بەر ئەو فەرموودەیەی کە لە دایکە ( **عائشة** ) وە ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : " كَانَ يَكونَ عَلَيَّ الصَّوم مِنْ رَمَضَان فَمَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَقْضِيَهُ إِلا فِي شَعْبَان " (١٣٥) .

واتە : قەزای ڕەمەزانم لە سەر ئەمایەوە ونەم دەتوانی قەزای بکەمەوە لە شەعباندا نەبێ .

ئیمامی ( **الحافظ** ) ــ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ لە کتێبی ( **الفتح** ) دا : ( ٤ / ١٩١ ) فەرموویەتی : ( فەرموودەکە بەڵگەیە لە سەر دواخستنی قەزاکردنەوەی ڕەمەزان ، جا ئەو دواخستنە لە بەر عوزرێك بێ یان بێ عوزر بێ ) .

ئەوەش ئاشکرا و بەڵگە نەویستە زوو قەزاکردنەوەی چاکترە لە دواخستنی ، چونکە زوو قەزاکردنەوەی ئەچێتە ژێر ئاماژەی گشتی ئەو بەڵگانەی کە ئاماژە بە پەلە کردن دەکەن لە کاری خێردا و دوانەخستنی ، بەڵگەی ئەوەش لە قورئانی پیرۆزدا : ﴿ وَسَارِعُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ ﴾ [آل عمران : ١٣٣] ، واتە : پێش برکێ بکەن بۆ بەدەست هێنانی لێ خۆش بوونی پەروەردگارتان .

هەروەها ووتەی خوای بە توانا و پایە بەرز : ﴿ أُولَئِكَ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَهُمْ لَهَا سَابِقُونَ ﴾ [المؤمنون : ٦١] .

**٢ ـ** پێویست نىیە قەزاکردنەوەکە لە دوای یەك بن ، بەوەی کە چۆنێتی قەزاکردنەوەی بشوبهێنرێت بە چونێتی ئەدا کردنی ، لە بەر ووتەی خوای پایە بەرز : ﴿ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ﴾ [البقرة : ١٨٥] .

وە ( **ابن عباس** ) ـ ڕەزای خوا لە خۆی وباوکیشی بێت ـ فەرموویەتی : (( لا بَأسَ أَنْ يُفَرَّق )) (١٣٦) .

---

(١٣٥) أخرجهُ البخاري : ( ٤ / ١٦٦ ) رقم : ( ١٩٥٠ ) ، ومسلم رقم : ( ١١٤٦ ) .

(١٣٦) عَلَّقَهُ البخاري : ( ٤ / ١٨٩ ) ، ووصله عبدالرزاق ، والدارقطني ، وابن أبي شيبة ، بسندٍ صحيح . وانظر : ( تغليق التعليق ) : ( ٣ / ١٨٦ ) .

واتە : نكوڵی و هیچ لەوەدا نىیە ئەگەر جیا بكرێنەوە .

وە ( **أبو هريرة** ) ﷺ فەرموویەتی : (( يُواتِرُهُ إِنْ شَاءَ )) [١٣٧] .

واتە : ئەگەر بیەوێت ئەتوانی تاكی بكات ، واتە لێك جیا بكرێتەوە .

بەڵام سەبارەت بەو فەرموودەیەی كە لە ( **أبو هريرة** ) وە ﷺ دەیگێڕنەوە بە ( **مرفوع** ) ی : " مَنْ كَانَ عَلَيْهِ صَوْمٌ مِنْ رَمَضَان فَلْيَسْرِدْهُ وَلا يُقَطِّعُهُ " [١٣٨] .

واتە : ئەو كەسەی ڕۆژووی ڕەمەزانی لە سەرە با لە سەر یەك بن و نێوانیان نەخات .

ئەم فەرموودەیە لاوازە ( واتە : **ضعيف** ) ە .

پوختەی ووتەش ئەوەیە كە هێچ فەرموودەیەكی ( **مرفوع** ) ی (**صحيح**) نیە - لە سنوری زانستماندا - لە سەر جیاكردنەوە یان لە دوای یەك بوون ، نزیك ترین و ئاسان ترینیان ئەوەیە كە هەر دوو شێوەكە ڕەوایە ، ئیمام و پێشەوای ئەهلی سوننە ( **أحمد بن حنبل** ) یش - ڕەحمەتی خوای لێبێت - ئەمەی فەرمووە ، ئیمامی( **أبو داود** ) لە ( **مسائل** )ە كەیدا : ( **ص : ٩٥** ) فەرموویەتی : (( بیستم پرسیار كرا لە ( **أحمد** ) دەربارەی قەزای ڕەزمەان ؟ فەرمووی : ئەگەر ویستی جیا یان دەكاتەوە ، وە ئەگەر ویستی لە سەر یەك دەیگرێ )) خواش زاناترە .

لە بەر ئەوە ، ڕەوا بوونی لێك جیا كردنەوەیان ، نەفی لە سەر یەك بوونیان ناكات .

**٣ -** زانایان كۆ ڕان لە سەر ئەوەی كە ئەگەر كەسێك مرد و نوێژی لە دەست چوویی لە سەر بوو وەلییەكەی ( كەسوكاری ) لە جیاتی قەزای ناكاتەوە ، نەخۆی و نە جگە لە ویش ، هەروەها هەر كەس توانای ڕۆژووی نەبێ كەس ڕۆژوو ناگرێت لە جیاتیدا تا لە ژیاندا ما بێ بەڵكو بەرامبەر بە هەر ڕۆژێك نانی هەژارێك دەدات ، هەر وەكو چۆن ( **أنس** ) ﷺ ئەنجامی دا لەو ( **أثر** )ەی كە پێش كەمێك هێنامانەوە .

بەڵام ئەو كەسەی بمرێت و ڕۆژووی نەزری لە سەر بێ وەلییەكەی لە جیاتی ڕۆژوو دەگرێت ، لە بەر ئەو فەرموەدەیەی پێغەمبەر ﷺ كە تێیدا فەرموویەتی : " مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صَوْمٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ " [١٣٩] .

واتە : هەر كەسی مرد و ڕۆژووی لە سەر بوو وەلییەكەی لەجیاتی ڕۆژوو دەگرێت .

---

[١٣٧] راجع له ( إرواء الغليل ) : ( ٤ / ٩٥ ) .
[١٣٨] وقد زدنا هذا بياناً بالاستفسار مشافهةً من شيخنا ( الألباني ) نفع الله به ، فَذَكَرَ نحواً مِمَّا كتبنا ، و الحمد لله حَقَّ حمده .
[١٣٩] أخرجهُ البخاري : ( ٤ / ١٦٨ ) رقم : ( ١٩٥٢ ) ، ومسلم رقم : ( ١١٤٧ ) .

وە لە ( **ابن عباس** ) ەوە ـ ڕەزای خوا لە خۆی و باوکیشی بێت ـ فەرموویـەتی : " جَاءَ رَجُلٌ إِلى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صَوْمُ شَهْرٍ فَأَقْضِيهِ عَنْهَا ؟ قَالَ : نَعَمْ ، فَدَيْنُ اللهِ أَحَقُّ أَنْ يُقْضَى " [١٤٠] .

واتە : پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و فـەرمووی : ئـەی پێغەمبـەری خـوا ، دایكـم مردووە و ڕۆژووی مانگێكی لە سەرە ، ئایا لە جیاتی قەزای بكەمەوە ؟ فەرمووی : بەڵێ قەرزی خوا لە پێشترە بۆ ئەوەی قەزا بكرێتەوە .

ئەم فەرموودە گشتیانە ئاشكران لەوەی كە ڕۆژوو گرتنی وەلـی ( كەسـوكار ) لـە جیـاتی مـردوو ڕێی پێ دراوە بە هەموو جۆرەكانیەوە ، ئەمەش ووتەی هەندێكە لە شافعی مەزهەبەكان ، و بۆچوونی ( **ابن حزم** ) ە : ( ٧ / ٢ ، ٨ ) .

بەڵام ئەم فەرموودانە لەو فەرموودە گشتیانەن كـە تایبـەت كـراون ، كەواتـە : هـیچ وەلی یـەك ڕۆژوو ناگرێت لە جیاتی مردوو جگە لە ڕۆژووی (**نەزر**) نەبێ ئەمەش ووتـەی پێـشەوا ( **أحمـد** ) ە هـەر وەكو چۆن لە ( **مسائل الإمام أحمد** ) دا هاتووە لە ڕیوایەتی ( **أبو داود** ) : ( ص ٩٦ ) : فەرموویەتی : (بیستم ( **أحمد بن حنبل** ) فەرمووی : ڕۆژوو ناگیرێت لە جیـاتی مـردوو جگـە لـە ڕۆژووی نـەزر ( **صـوم النذر** ) نـەبێ ، ئیمـامی ( **أبـو داود** ) دەڵـێ ووتم بـە ( **أحمـد** ) : ئـەی مـانگی ڕەمـەزان ؟ فـەرمووی : خواردن دەدرێ لە جیاتیدا ) .

ئەم بۆچوونەشە كە نەفس پێی ئارام دەبێ ، دڵیش پێی دەكرێتەوە ، سنگیش فێنك دەكاتەوە ، و فیقهی بەڵگەش ( **فقه الدليل** ) هەڵی دەبژێرێت ، چونكە ئەم بۆچوونە كار كردنی تیایە بـە هـەموو ئەو فەرموودانەی كە لەم بارەوە هاتوون ، بە بـێ ڕەتكردنـەوەی هـیچ یـەكێكیان لـە گـەڵ تێگەیـشتنی ڕاست بۆیان ، بەتایبەتی یەكەمیان ، چونكە ( **عائشة** ) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ بەو ڕەهـایی ( **مُطلق** ) یە لێی تێ نەگەیشت كە ڕۆژووی ڕەمەزان و جگە لەویش بگرێتەوە ، بەڵكو بۆ ئەوە دەچوو كە خواردن بدرێت و ئەمەشی لێ دەگێڕنەوە بەو بەڵگەیەی كە ( **عمرة** ) دەیگێڕێتەوە : (( كە دایكی مردوو هەندێ ڕۆژووی ڕەمەزانی لە سەر مابوو ، بە ( **عائشة** ) ی فەرموو : قەزای بكەمەوە لە جیاتیدا ؟ فـەرمووی : نەخێر ، بەڵكو بەرامبەر بە هەر ڕۆژێك نیو ( **صاع** ) بدە بە هەژارێك )) [١٤١] .

واش بڕیار دراوە كە ڕاوی فەرموودە ( واتە : ئەو كەسەی فەرموودەكە دەگێڕێتـەوە ) لـە هـەموو كەس شارەزاترە بە واتای ئەوەی كە دەیگێڕێتەوە .

---

[١٤٠] أخرجهُ البخاري : ( ٤ / ١٦٩ ) رقم : ( ١٩٥٣ ) ، ومسلم رقم : ( ١١٤٨ ) .

[١٤١] أخرجهُ الطحاوي في ( مشكل الآثار ) : ( ٣ / ١٤٢ ) ، و ابن حزم في ( المحلى ) : ( ٧ / ٤ ) ــ واللفظ له ــ بسندٍ صحيح .

( **حبر الأُمَّة** ) ە واتـە : ( **ابـن عبـاس** ) یـش ـ ڕەزای خـوا لـە خـۆی و باوکیـشی بێـت ـ هـەمان بۆچوونی هەیە و فەرموویەتی : ( ئەگـەر مـرۆڤ نـەخۆش کـەوت لـە ڕەمەزانـدا ، پاشـان مـرد و ڕۆژووی نەگرت ، لە جیاتی ئەوە خواردن دەدرێت و قەزای لە سەر نیە ، وە ئەگەر قەزای نەزر ( **صومُ النـذر** ) ی لە سەر بوو وەلیـیەکەی لەجیاتی ئەودا قەزای دەکاتەوە ) [١٤٢] .

ئـەوەیش ئاشـکرایە کـە ( **ابـن عبـاس** ) ـ ڕەزای خـوا لـە خـۆی و باوکیـشی بێـت ـ خـۆی ڕاوی فەرموودەی دووەمە ، بەتایبەت کـە فەرموودەیـەکی گێڕاوەتـەوە بەڵگەیـە لـە سـەر ئـەوەی وەلـی لـە جیاتی مردوو ڕۆژووی نەزر ( **صومُ النذر** ) دەگرێت ، فەرموودەکەش : " **أنَّ سَعْدَ بنَ عُبَادَة** ﵁ اسْتَفْتَى رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَ : إنَّ أُمي مَاتَتْ وَعَلَيْها نَذْرٌ ؟ فَقَالَ : اقْضِه عَنْهَا " [١٤٣] .

واتە : ( **سعد بن عبادة** ) ﵁ پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی : دایکم مـردووە و ڕۆژووی نەزری لە سەرە ؟ فەرمووی : لە جیاتی قەزای بکەرەوە .

ئەم لێك دانەوەش دەگونجێ لە گەڵ بنەواکانی شەریعەتدا هەر وەکو چـۆن ( **العلامة ابن القيم** ) لە کتێبی ( **إعلام الموقعين** ) یدا ڕوونی کردۆتەوە ، وە زیـاتر ڕونکردنـەوە و توێژینـەوەی ( **التوضیح و التحقيق** ) لەو بارەیەوە کـردووە لـە ( **تهـذيب سـنن أبـي داود** ) دا : ( ٣ / ٢٧٩ – ٢٨٢ ) ، جـا بـۆی بگەڕێرەوە چونکە گرنگە .

**٤ ـ** ئەگەر کەسێك بمرێت و ڕۆژووی نەزری لە سەر بێ ، ئەوا ڕەوایە کۆمەڵێك پیاو ڕۆژوو بگرن بـە ژمارەی ئەو ڕۆژانەی کە لە سەریەتی ، **حەسەنی بەصری** فەرموویەتی : ( ڕەوایە ئـەگـەر سـی پیـاو لـە جیاتی کەسێك هەر یەکێك ڕۆژێك ڕۆژووی بۆ بگرێت ) [١٤٤] .

سەبارەت بە خواردن ، ڕەوایە ئەگەر وەلیەکەی بە ژمارەی ئەو ڕۆژانەی کـە لـە سـەریەتی هـەژار کۆ بکاتەوە و تێر خواردنیان بکات ، هەر وەکو چۆن ( **أنس بن مالك** ) ﵁ ئەم کارەی ئەنجام داوە .

---

[١٤٢] أخرجهُ أبو داود بسندٍ صحيح ، وابن حزم في ( المحلى ) : ( ٧ / ٧ ) وصحح إسنادهُ .

[١٤٣] رواه البخاري ومسلم وغيرهما .

[١٤٤] أخرجهُ البخاري : ( ٤ / ١١٢ ) مُعَلَّقاً ، ووصلهُ الدارقطني في ( كتاب المُدَبَّج ) وصحَّحَ سندَهُ شيخُنا الألباني في ( مختصر صحيح البخاري ) : ( ١ / ٥٨ ) . وانظر : ( تغليق التعليق ) : ( ٣ / ١٨٩ ) .

( **تنبيه** ) : تَحَرَّفَ اسمُ كتاب ( المُدَبَّج ) في بعض المراجع إلى كتاب ( الذبح ) ! و هو تحريفٌ قبيحٌ فتذكَّرْ .

## کەفارەت دان :

١ ـ فەرموودەی ( **أبـو هريـرة** ) رضي الله عنه دەربـارەی ئـەو پیـاوەی کـە لـە نیـوەڕۆی ڕەمەزانـدا لەگـەڵ خێزانەکەی دا جووت بوو بوو لە پێشدا باس کرا کە چۆن قەزاکردنەوە و کەفارەتی لە سەرە ، ئەوەیش : ڕزگـار کردنـی کۆیلەیەکـە ، ئەگـەر دەسـتی نەکـەوت ڕۆژووگـرتنی دوو مـانگی لـە سـەریەك ، ئەگـەر نەیتوانی خواردن پێدانی شەست هەژار .

وە ووتراوە : کە کەفارەتی جووت بوون بە هەڵبژاردنە ( **التخيير** ) نەك بە لەدوا یەك ( **الترتيب** ) ، بەڵام ئەوانەی ڕیوایەتی لە دوای یەك دەگێڕنەوە زۆر ترن و ڕیوایەتەکەیان هەڵبژاردەتر ( **أرجح** ) ە ، چونکە ژمارەیان زیاترە ، و زیادەی زانستیان پێیە . لە کاتێکدا کۆ ڕان لـە سـەر ئـەوەی کـە جـووت بوون ڕۆژوو بەتاڵ کرەوەیە ، کە چی ئەمە ڕوی نەدا لە ڕیوایەتەکانی تردا ، ئـەو کەسـەش کـە زانـستی پێبێ بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە زانستنی پێ نییە ، هەروەها لەو هۆکارانەی کـە تـەرجیحی لـە دوای یەکەکە ( **الترتيب** ) دەدەن ئەوەیە کە ئەمەیان باشترە ، وە لە بـەر ئـەوەی کـە کـار پێکردنـی بـەتاڵ نییە ئەگەر بڵێین بە هەڵبژاردنە یان نە ، بە پێچەوانەی دژەکەی .

٢ ـ ئەو کەسەی کەفارەت دان بیگرێتەوە و توانای نەبێ بە سەر ڕزگار کردن و ڕۆژوو و خواردنـدا کەفارەتەکەی لە سەر دەکەوێ ، چونکە داواکاری ( واتـە : **التكليـف** ) بەسـتراوە بـە توانـاوە ، خـوای پایـە بـەرز فەرموویـەتی : ﴿ لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾ [البقـــرة : ٢٨٣] ، وە بـە بەڵگـەی کـرداری پێغەمبـەر ﷺ کـە کـەفارەتی لـە سـەر پیاوەکـە لادا کاتـێ دەسـت کـورتی خـۆی پـێ ڕاگەیانـد ، وە سەبەتەیەك خورمای پێ بەخشی بۆ ئەوەی بە خواردنی خێزانەکەی بدات .

٣ ـ هێچ کەفارەتێك ئافرەت ناگرێتەوە ، چونکە پێغەمبەر ﷺ کردەوەیەکی پێ ڕاگەیەنرا ڕوویـدا بوو لە نێوان پیاوەکە و خێزانەکەیدا ، دەبینین پێغەمبەر ﷺ یەك کەفارەت زیاتری پێویـست نـەکرد . خواش زاناترە .

## فیدیەدان :

**١ ـ ٢** / ئافرەتی سك پڕ و شیردەر ئەگەر لەخۆیان و منداڵەكانیان بترسن بە ڕۆژوو نا بن و هەموو ڕۆژێك خواردنی **هەژارێك** دەدەن ، بەڵگەی ئەوەیش لە كتێبی خوای پەروەردگار دا : ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾ ، ڕووی **هەڵێنجاندی** بەڵگەش ( **وجه الإستدلال** ) ئەوەیە كە ئەم ئایەتە تایبەتە بە پیاو و ئافرەتی پیر و نەخۆشێك كە هیوای چاك بوونەوەی لێ نەكرێ و شیردەر و سك پڕ ئەگەر لە خۆیان و منداڵەكانیان بترسن ، هەر وەكو باسەكە ئاشكرا دەكرێت لە ڕیوایەتەكانی ( **ابن عباس** ) و (**ابن عمر**) ەوە رضي الله عنهم .

**٣** ـ برای باوەڕدار ـ لەوەی كە ڕۆیشت ـ ئەوەت بۆ دەركەوت كە ئەم ئایەتە ( **نەسخ** ) كراوتەوە ، لە بەر هەردوو فەرموودەی ( **ابن عمر** ) و (**سلمة بن الأكوع**) رضي الله عنهم بەڵام لە ( **ابن عباس** ) ەوە دەگێڕنەوە كە ( **نەسخ** ) نەكراوەتەوە و تایبەتە بە پیاو و ژنی پیرەوە كە توانای ڕۆژوو گرتنیان نیە پێویستە هەموو ڕۆژێك خواردن بدەن بە **هەژارێك** [١٤٥] .

لە بەر ئەمە لەوانەیە گومانی ئەوە ببرێت كە ( **ابن عباس** ) پێچەوانەی زۆربەی **هاوەڵانە** ، یان دوو بۆچوونی دژ یەكی هەیە ، بەتایبەت ئەگەر زانیت بەڕاشكاوی لە ڕیوایەتی تردا فەرموویەتی ( **مەنسوخە** ) ڕیوایەتەكەش ئەمەیە كە دەفەرموێ : (( رَخَصَ لِلشَّيْخِ الْكَبِيْرِ وَالْعَجُوزِ الْكَبِيْرَةِ فِي ذَلِكَ وَهُمَا يُطِيْقَانِ الصَّومَ أَنْ يُفْطِرَا إِنْ شَاءَا أَوْ يُطْعِمَا مَكَانَ كُلَّ يَوْمٍ مِسْكِيْنًا وَلا قَضَاءَ عَلَيْهِمَا ، ثُمَّ نُسِخَ ذَلِكَ فِي هَذِهِ الآيَةِ : ﴿ فَمَنْ شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾ ، وَثَبَتَ لِلشَّيْخِ الْكَبِيْرِ وَالْعَجُوزِ الْكَبِيْرَةِ إِذَا كَانَا لا يُطِيْقَانِ الصَّوْمَ ، وَالْحُبْلَى والْمُرْضِعُ إِذَا خَافَتَا أَفْطَرَتَا وَأَطْعَمَتَا كُلَّ يَوْمٍ مِسْكِيْنًا )) [١٤٦] .

واتە : ڕێدراوە بە پیاو و ژنی پیر لەوەدا كە توانای ڕۆژووشیان هەبێ ڕۆژووكەیان بشكێنن ئەگەر ویستیان ، یان **هەموو** ڕۆژێك خواردنی **هەژارێك** بدەن و قەزاشیان لە سەر نیيە ، پاشان ( **نەسخ** ) بووەوە لەم ئایەتەدا : ﴿ فَمَنْ شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾ ، وە ئەوە جێگیر بوو كە پیاو و ئافرەتی پیر ئەگەر توانای ڕۆژوویان نەبێ و ئافرەتی سك پڕ و شیر دەریش ئەگەر لە خۆیان و منداڵەكانیان ترسان هەموو ڕۆژێك خواردنی **هەژارێك** بدەن .

ئەو كۆمەڵەیەی سەیری ڕووكەش ( **ظاهر** ) ی ڕیوایەتی پێشوویان كردووە لە لای ( **البخاري** ) لە ( **كتاب التفسير** ) لە ( **صحيح** )ە كەیدا كە ئاشكرایە لە نەفی كردنی ( **نەسخ** ) دا ، گومانی ئەوەیان برد

---

(١٤٥) أخرجهُ البخاري : ( ٨ / ١٣٥ ــ الفتح ) .

(١٤٦) أخرجهُ ابن الجارود رقم : ( ٣٨١ ) ، والبيهقي : ( ٤ / ٢٣٠ ) ، وأبو داود رقم : ( ٢٣١٨ ) ، و سندهُ صحيحٌ .

كە (**حبرُ الأمة**) پێچەوانەی زۆربەی هاوەڵانە ، بەڵام كە پێكدادانیان كرد لە گەڵ ئەو ڕیوایەتەی كە بەڕاشكاوی باس لە ( **نەسخ** ) دەكات ، گومانی ئەوەیان برد كە دوو بۆ چوونی دژ یەكی هەیە !!

بەڵام ڕاستیەیەك كە گومانی تێدا نەبێ ئەوەیە كە ئایەتەكە (**مەنسوخە**) بەڵام بە تێگەیشتنی پێشین ( **سەلەف** ) بۆ ( **نەسخ** ) ، چونكە پێشینە پیاوچاكان ـ ڕەزای خوایان لێبێت ـ ووشەی ( **نەسخ** ) یان دەفەرموو بەرامبەر بە هەڵگرتنی ئاماژەی گشتی و ڕەها و ڕوكەش و جگە لە مانەشیان هەندی جار بەنەسخ دادەنا (( فقد كان السلف الصالح يُطلقون النسخ على رفع دلالة العام والمطلق والظاهر وغيرها تارةً )) ، بۆ نموونە بە تایبەت كردن و تەقید كردن و لیكدانەوەی موقەیەدێك بە ڕەهایەك و ڕاڤە كردن و ئاشكرا كردنیان دەوت نەسخ ، تەنانەت هەندی جار بە (**الاستثناء**) واتە : لێدەركردن ، و (**الشرط**) واتە : مەرج ، و سیفەش (**الصفة**) دەڵێن نەسخ ، چونكە ئەوانە هەڵگرتنی ئاماژەی ڕوكەش و ئاشكرا كردنی مەبەستی تێدایە .

كەواتە : نەسخ لە زمانی ئەواندا برێتی یە لە ئاشكرا كردنی مەبەست بە شتێكی دەرەكی نەك بەخودی ڕستەكە [١٤٧] .

ئاشكراشە كە هەر كەسێ بڕوانێتە ووتەكانیان ووتەیەكی زۆر ـ كە نایەتە ژماردن ـ دەبینێت لەو بابەتەو ، ئەو ئیشكالاتەنەی لا نامێنێ كە هۆكارەكەی لێكدانەوەی ووتەكانیانە لە ڕوانگەی زاراوەی تازەی دواییینەكان ( **اصطلاح المتأخرين** ) ، ئەو ووتەیەی كە بریتی یە لە هەڵگرتنی حوكمێكی شەرعی پێشوو بە بەڵگەیەكی شەرعی دواتر تایبەت بەداوا لێكراوان (( واتە : **المكلفون** )) .

٤ـ ئەوەش پشتگیری ئەم واتایە بكات ئەوەیە كە ئایەتەكە گشتیەیە بۆ هەموو داوا لێ كراوێك ، ئەوانەی توانایان هەبێ بە ڕۆژوو بن و ئەوانەیش توانایان نیە بە ڕۆژوو بن دەیانگرێتەوە ، بەڵگەی ئەوەیش لە سوننەتدا ئەو فەرموودەیەیە كە ئیمامی ( **مسلم** ) لە ( **سلمة بن الأكوع** ) ەوە ﵁ دەیگێڕێتەوە كە فەرموویەتی : " كُنَّا فِي رَمَضَانَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ مَنْ شَاءَ صَامَ ، وَمَنْ شَاءَ أَفْطَرَ فَافْتَدَى بِطَعَامِ مِسْكِينٍ ، حَتَى نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَة : ﴿ فَمَنْ شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾ " .

واتە : ئیمە لە ڕەمەزان دا لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ هەر كەسێ بیویستایە بە ڕۆژوو دەبوو ، ئەوەش بیویستایە بە ڕۆژوو نە دەبوو و خواردنی هەژارێك فیدیەی دەدا ، تا ئەو كاتەی ئەم ئایەتە : ﴿ فَمَنْ شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾ هاتە خوارەوە .

[١٤٧] راجع لذلك : ( إعلام الموقعين ) : ( ١ / ٣٥ ) لابن القيم ، و ( الموافقات ) : ( ٣ / ١١٨ ) للشاطبي .

لەوانەیە فەرموودەی ( **ابن عباس** ) کە بەڕاشکاوی باسی ( **نەسخ** ) دەکات هەندێك ئیشکال دروست بکات کە دەفەرمووێ : ڕێپێدانەکە بۆ پیاو و ئافرەتی پیر بوو کە لە توانایاندا بووە ، بەڵام ئەم ئیشکالە نامێنێت ئەگەر لات ڕوون بووەوە کە ئەو ووتەیە بۆ بەڵگە هێنانەوەیە نەك بۆ تایبەت کردنی ، بەڵگەی ئەم تێگەیشتنەش خودی فەرموودەکەیە چونکە ئەگەر ڕێپیدانەکە بۆ پیاو وئافرەتی پیر بوو پاشان ( **نەسخ** ) کراو مایەوە بۆ پیاو وئافرەتی پیر ، واتای ئەم ڕێپێدانە کە جارێك ڕێی پێ دەدرێت وجاریکی تر نەفی دەکرێ ئەگەر مەبەست لە باس کردنی لە لایەنیانەوە ڕێپێدان وبەڵگە هێنانەوە نەبێ نەك تایبەت کردن؟ واتای چی دەبێ؟

ئەگەر ئەوەت بۆ ئاشکرا بوو ، پێی دڵنیا بووی ، ئەوەت لاجێگیر دەبێت کەواتای ئایەتەکە ( **مەنسوخە** ) سەبارەت بە ئەوانەی توانای ڕۆژوویان هەیە ، وە مەنسوخیش نیە سەبارەت بەوانەی کە توانای ڕۆژوو گرتنیان نیە ، حوکمی یەکەم بە ئاماژەی قورئان ( **نەسخ** ) بوەتەوە ، بەڵام حوکمی دووەم جێگیرە بە ئاماژەی سوننەت و ( **نەسخ** ) یش نەبووتەوە تا ڕۆژی دوایی .

ئەو ووتەیەی کە ( **ابن عباس** ) لەو ڕیوایەتەیدا کە بە ڕاشکاوی باس لە ( **نەسخ** ) دەکات ئەم بۆچوونە پتەو دەکات : (( وَثَبَتَ لِلشَّيْخِ الْكَبِيْرِ وَالْعَجُوزِ الْكَبِيْرَةِ ، إِذَا كَانَا لا يُطِيْقَانِ الصَّوْمَ ، وَالْحُبْلَى والْمُرْضِعُ إِذَا خَافَتَا أَفْطَرَتَا وَأَطْعَمَتَا كُلَّ يَوْمٍ مِسْكِيْنًا )) .

وە زیاتر فەرموودەکەی ( **معاذ بن جبل** ) ئاشکرای دەکات ﵁ کە فەرموویەتی : (( أَمَّا أَحْوَالُ الصِّيَامِ ، فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَدِمَ الْمَدِينَةَ فَجَعَلَ يَصُومَ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ، وَصِيامَ عَاشُوراءَ ، ثُمَّ إِنَّ اللهَ فَرَضَ عَلَيْهِ الصِّيَامَ فَأَنْزَلَ اللهُ : ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ...﴾ الآية ، ثُمَّ أَنْزَلَ اللهُ الآيَةَ الأُخْرَى : ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ...﴾ الآية ، فَأَثْبَتَ اللهُ صِيَامَهُ عَلَى الْمُقِيمِ الصَّحِيحِ ، وَرَخَّصَ فِيهِ لِلْمَرِيضِ وَالْمُسَافِرِ ، وَثَبَتَ الإِطْعَامَ لِلكَبِيرِ الَّذِي لا يَسْتَطِيعُ الصِّيَامَ فَهَذانِ حَوْلانِ ... )) [١٤٨] .

بەم دوو فەرموودەیەش ئاشکران بۆ ڕوون کردنەوەی ئەوەی کە ئایەتەکە ( **مەنسوخە** ) سەبارەت بە کەسێك توانای ڕۆژووی هەبێ ، و مەنسوخ نیە سەبارەت بە کەسێك توانای ڕۆژووی نیە ، واتە : ئایەتەکە تایبەت دەکات .

لە بەر ئەوە ( **ابن عباس** ) هاو دەنگە لە گەڵ هاوەڵان ، فەرموودەکەشی دەگونجێ لە گەڵ فەرموودەی ( **عبدالله بن عمر** ) و (**سلمة بن الأكوع**) ﵄ هەروەها ووتەکانی دژ یەك نین ، چونکە ووتەی : (( لَيْسَتْ بِمَنْسُوخَةَ )) ڕاقە ( **تەفسیر** ) دەکرێت بە ووتەی (( إِنَّهَا مَنْسُوخَةَ )) ، واتە :

---

(١٤٨) أخرجهُ أبو داود في ( سننه ) رقم : ( ٥٠٧ ) ، و البيهقي في ( سننه ) : ( ٤ / ٢٠٠ ) ، و أحمد في ( المُسنَد ) : ( ٥ / ٢٤٦ ــ ٢٤٧ ) ، و سندهُ صحيحٌ .

ئایەتەکە تایبەت دەکات ، بەمەش ئاشکرا دەبێت کە زاراوەی ( **النسخ** ) لە تێگەیشتنی هاوەڵاندا بەرامبەرە بە زاراوەی : ( **التخصیص** ) یان (**التقید**) لە تێگەیشتنی (**الأصولیین المتأخرین**) واتە : زانا دوانیەکانی ( **الأصول** ) ، وە ئیمامی (**القرطبي**) ئاماژەی بەمە کردووە لە (**تفسیر**)ە کەیدا [١٤٩] .

٥ - برای موسوڵمان لەوانەیە گومانی ئەوە ببەی ئەوەی کە لە ( **ابن عباس** ) و ( **معاذ بن جبل** ) دەیگێڕنەوە ﷺ تەنها ( رأي واجتهاد وإخبار ) : ئیجتهاد و بۆچوونی خۆیان بێ و گێڕانەوە بێ ، و ناگاتە پلەی فەرموودەی ( **المرفوع** ) کە حوکمی گشتی ( **عام** ) ی قورئانی پێ تایبەت (**تخصیص**) دەکرێ ، یان ڕەها ( **مُطلق** ) کانی قورئان پێ قەید ( **تقید** ) دەکرێ ، و گشتی ( **مُجمل** ) ەکانی قورئان پێ ڕاڤە دەکرێت ، وەڵامی ئەوەش ئەمەیە :

**أ** / ئەم دوو فەرموودەیە حوکمی ( **الرفع** ) یان هەیە ، بەکۆڕای زانایانی زانستی فەرموودەکانی پێغەمبەر خوا ﷺ بۆیە نا بێت هیچ باوەڕدارێك - کە خوا و پێغەمبەری ﷺ خۆش دەوێ - ئەگەر ئەم دوو فەرموودیەی لە لا جێگیر بوو پێچەوانەیان بکات ، چونکە ئەم دوو فەرموودەیە دەربارەی ڕاڤە ( **تفسیر** ) یەك هاتوون پەیوەندە بە هۆکاری هاتنە خوارەوەوە ( واتە : أسباب النزول ) .

واتە : ئەم دوو هاوەڵە کە ئامادەی هاتنە خوارەوەی ( **وەحی** ) و دابەزینی ئایەتەکان بوون ، وە هەواڵیان دەربارەی یەکێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دابێ کە لە ئەو شتە دابەزیووە ، بێ گومان ئەم ووتەیە فەرموودەیەکی (**مُسْنَد**) ە [١٥٠] .

**ب** / ( **ابن عباس** ) ئەم حوکمەی داوە بۆ ئافرەتی سك پڕ و شیردەر ، باشە لە کوێوە ئەم حوکمەی داونەتێ ؟ گومان لەوە دا نیە کە لە سوننەتەوە ، بە تایبەت خۆی بە تەنها ئەمەی نەفەرمووە ، بەڵکو (**عبدالله بن عمر**) هاو دەنگە لە گەڵی دا کە دەگێڕێتەوە ئەم ئایەتە (**مەنسوخە**) .

لە ( **مالك** ) ەوە دەگێڕنەوە ئەویش لە ( **نافع** )ەوە کە (**ابن عمر**) پرسیاری لێ کرا دەربارەی ئافرەتی سك پڕ ئەگەر لە منداڵەکەی ترسا ، فەرمووی : " تُفْطِرُ وَتُطْعِمُ مَكَانَ كُلَّ يَوْمٍ مِسْكِيْنَاً مُدَّاً مِنْ حِنْطَةٍ " [١٥١] ، واتە : ڕۆژوو ناگرێت و بەرامبەر بە هەر ڕۆژێك خواردنی هەژارێك دەدات (**مُد**)یك لە گەنم .

وە لە ( **ابن عمر** )ەوە دەیگێڕینەوە کە فەرموویەتی : " الحَامِلُ وَالمُرْضِعُ تُفْطِرُ وَلا تَقْضِي " [١٥٢] ، واتە : ئافرەتی سك پڕ و شیردەر ڕۆژوو ناگرێت و قەزاشی ناکاتەوە .

---

(١٤٩) المُسَمَّى: ( الجامع لأحكام القرآن ) : ( ٢ / ٢٨٨ ) .

(١٥٠) انظر: ( تدريب الراوي ) : ( ١ / ١٩٢ ـــ ١٩٣ ) للسيوطي ، و ( علوم الحديث ) ص : ( ٢٤ ) لابن الصلاح .

(١٥١) أخرجهُ البيهقي في ( سننه ) : ( ٤ / ٢٣٠ ) من طريق الإمام الشافعي ، و سندهُ صحيحٌ .

(١٥٢) أخرجهُ الدارقطني : ( ١ / ٢٠٧ ) و صَحَّحَهُ .

وە لە ڕێگەیەکی تـرەوە : " أنَّ امْرَأتَهُ سَأَلَتْهُ وَهْيَ حُبْلَى ، فَقَالَ : أَفْطِري وَأَطْعمي عَنْ كُـلِّ يَـومٍ مسْكِيْنَاً وَلا تَقْضي " ( **إسناد** )ە کەشی (**جيد**)ە ، وە لە ڕێگەی سێیەمەوە هەر لەوەوە ﵁ : " أنَّ بِنْتَاً لَهُ كَانَتْ تَحْتَ رَجُلٍ مِنْ قُرَيْش ، وَكَانَتْ حَامِلاً ، فَأَصَابَهَا عَطَشٌ في رَمَضَان ، فَأَمَرَهَا أَنْ تُفطِرَ وَتُطْعِمَ عَنْ كُلِّ يَوْمٍ مسْكِيْنَاً " .

**ج** / هیچ لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پێچەوانەی (**ابن عباس**) نین [١٥٣] ﵄ .

ئەم ڕوون کردنەوە واتای لا بردنی ڕۆژوومان بۆ دەکات لە سەر ئافرەتی سك پڕ و شیردەر کە لە فەرموودەکەی پێشووی ( **أنس بن مالك الكعبي** ) ەوە هاتووە ، وە ئەوەش کە تایبەتە بە ترسان لە سەر خۆی و منداڵەکەی ، و ئەوەی کە فیدیە دانی لە سەرە نەك قەزاکردنەوە ، لە ( **ابن عباس** ) ەوە دەگێڕنەوە کە یەکێك ـ لەو کەنیزەکانەی کە منداڵی لێی هەبوو (**أم ولد**) ـ بە سك پڕی یان شیردەری بینی و فەرمووی : " أَنْتِ مِن الَّذينَ لا يُطِيْقُونَ ، عَلَيْكِ الجَزَاءُ ، وَلَيْسَ عَلَيْكِ القَضَاءُ " [١٥٤] .

واتە : تۆ لەوانەی کە توانای ڕۆژوویان نیە ، فیدیەدانت لە سەرە نەك قەزا کردنەوە .

هەر کەسێ ووتی لابردنی ڕۆژوو لە سەر سك پڕ و شیردەر وەکو لابردنی ڕۆژووە لە سەر ڕێبوار ( **موسافر** ) ، و لە سەر ئەوە بڕیاری دا کە پێویستە قەزای ڕۆژووکەی بکاتەوە ، ئەوا ووتەکەی ڕەت دەکرێتەوە و لێی وەرناگیرێت ، چونکە قورئانی پیرۆز واتای لابردنی ڕۆژووی لەسەر ڕێبواران ڕوون کردۆتەوە بە : ﴿ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ﴾ ، هەروەها واتای لابردنی ڕۆژووی لە سەر ئەوانەی کە توانایان نیە ڕوون کردۆتەوە بە : ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾ ئەوەشت لاجێگیر بووە کە سك پڕ و شیردەر لەوانەن کە ئەم ئایەتە دەیانگرێتەوە ، بەڵکو تایبەتە بەوانەوە .

[١٥٣] كما نَصَّ ابنُ قُدامَة في ( المُغني ) : ( ٣ / ٢١ ) .
[١٥٤] أخرجهُ الدارقطني : ( ١ / ٢٠٧ ) .

## شەوی قــەدر :

ئەم شەوە فەزڵی گەورەیە ، چونکە شەوی هاتنـە خـوارەوەی قورئـانی پـیرۆزە ، ئـەو قورئانـەی ڕێنیـشاندەرە بـۆ کەسـێك دەسـتی پێـوە بگرێـت بـۆ ڕێگـەی سـەربەرزی و سـەرفەرازی ، بەرزیـشی دەکاتەوە بۆ چلەپۆپەی سەرفەرازی و مانەوەی هەتا هەتایی ئوممەتی ئیـسلامیش کـە شـوێنکەوتووی سوننەتەکانی پێغەمبەرکەیەتی ﷺ شوێن پێ بە شوێن پێ ، لەم شەوەدا ئـاڵا هـەڵ ناکـات ، و کـەوان دانانێ ، بەڵکو پێش برکێ دەکەن لە زینـدو کردنـەوەی بـە بـیر و بـاوەڕەوە لـە گـەڵ چـاوەڕێ کردنـی پاداشت لە لایەن خواوە .

ها بگرە برای موسوڵمان ئەمەش ئەو ئایەتە قورئانیانە و ئـەو فەرمووادنـەی پێغەمبـەرە ﷺ کـە لێی وە دەیگێڕنەوە و دەربارەی ئەم شەوە هاتووە ، **ئەوەش بەم شێوەیە :**

### ١ـ فەزڵی شەوی قەدر :

بەسە بۆ پایەی شەوی قەدر کە چاکترە لە هەزار مانگ ، خوای بە توانا و پایە بەرز فـەرموویەتی : ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ سَلَامٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ الْفَجْرِ﴾ [القدر : ١ ــ ٥] .

وە تیایدا هەموو کردارێکی دانایانە جیا دەکرێتەوە : خوای پایە بەرز فەرموویەتی : ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُّبَارَكَةٍ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ أَمْرًا مِّنْ عِندِنَا إِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ [الدخان : ٣ ــ ٦] .

### ٢ ـ کاتی شەوی قەدر :

ئەوەمان پێ گەیشتووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە ئەو شەوە شەوی بیست و یـەك ، و شـەوی بیست سێ ، و شەوی بیست و پێنج ، و شـەوی بیـست و حـەوت ، و شـەوی بیـست و نـۆ ، وە شـەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزانە [١٥٥] .

ئیمـامی (**الـشافعي**) فەرموویـەتی : (( ئەمـە لـە لای مـن وەکـو ئەوەیـە ـ خـواش زانـاترە ـ کـە پێغەمبەر ﷺ وەڵامـی دەدایـەوە بـەو پێیـەی کـە پرسیاری لـێ دەکـرا لـە سـەر ئـەو شـەوە ، پێیـان

---

[١٥٥] والأقوال الواردة فيها مختلفةٌ و متغايرةٌ ، و قد صنَّف الإمام العراقيُّ رسالةً مفردةً سمَّاها : ( شرح الصدر بذكر ليلة القدر ) استوعب فيها كــلام العلمــاء في المسألة ، فلتنظر .

دەفەرموو : ئایا بە دوایدا بگەڕێین لە شەوی ئەوەدا ، دەیفەرموو : بەدوایدا بگەڕێن لە شەوی ئەوەدا )) [١٥٦] .

ووتەی هەڵبژاردەش ئەوەیە کە لە ( **١٠** ) دە شەوە تاکەکانی کۆتایی ڕەمەزاندا بێ ، بەڵگەش لە سەر ئەمە فەرموودەی ( **عائشة** ) یە ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ کە فەرموویەتی : **" كَانَ رَسُـــولُ اللهِ ﷺ يُجَاوِرُ فِي العَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَان وَيَقُولُ : تَحَرَّوا ( وفي روايةٍ : الْتَمِسُوا ) لَيْلَةَ القَدْرِ فِي ( الوترِ مِن ) العَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَان "** [١٥٧] .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ لە دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزاندا لە مزگەوت دەمایەوە بۆ خوا پەرستی ( **الإعتكاف** ) ، و دەیفەرموو : لە تاکەکان لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان دا بگەڕێن بەدوای شەوی قەدر دا .

بەڵام ئەگەر مرۆڤ لاواز بوو یان توانای نەبوو با حەوتی کۆتایی لە دەست نەڕوات ، لە بەر ئەو فەرموودیەی کە لە ( **ابن عمر** ) ەوە دەیگێڕنەوە کە فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : **" التَمِسُوهَا فِي العَّشْرِ الأوَاخِرِ ، فإنْ ضَعُفَ أَحَدُكُم أَوْ عَجَزَ فَلا يغْلبَنَّ عَلَى السَّبْعِ البَوَاقِي "** [١٥٨] .

واتە : بەدوایدا بگەڕێن لە دە شەوی کۆتایی دا ، ئەگەر یەکێکان لاواز بوو یان توانای نەبوو ، با لە دەستی نەڕوات لەو حەوتەی کە ماون .

ئەمەش ئەو ووتەیەی پێغەمبەر ﷺ ڕاڤە و تەفسیر دەکات کە فەرموویەتی : **" أَرَى رُؤْيَاكُم قَدْ تَوَاطَأَتْ فَمَنْ كَانَ مُتَحَرِّيَهَا فَلْيَتَحَرِّهَا فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ "** [١٥٩] .

واتە : وا ئەبینم خەونەکانتان پێکهاتوون ئەگەر هەر کەسێ ویستی بەدوایدا بگەڕێت با لە حەوتی کۆتایدا بێ .

ئەوەش زانراوە لە سوننەتەوە کە زانینی ئەو شەوە هەڵگیراوە ، چونکە خەڵکی دوو بەرەکێیان کرد لە سەر ئەو شەوە و بە هۆیەوە هەڵگیرا ، لە (**عبادة بن الصامت**) رضي الله عنه دەگێڕنەوە فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوی قەدردا دەرچوو دوو پیاو لە موسوڵمانان دوو بەرەکێیان دەکرد لە سەر شەوی قەدر ، فەرمووی : **" إِنِّي خَرَجْتُ لأُخْبِرَكُم بِلَيْلَةِ القَدْرِ فَتَلاحَى [١٦٠] فُــلانٌ وَفُــلان فَرُفِعَــتْ ،**

---

[١٥٦] فيما نقله عنه البغوي في ( شرح السنة ) : ( ٦ / ٣٨٨ ) .

[١٥٧] أخرجهُ البخاري : (٢٢٥/٤ ) رقم : (٢٠١٧) و (٢٠١٩) و (٢٠٢٠) ، ومسلم رقم : (١١٦٩).

[١٥٨] أخرجهُ البخاري : ( ٤ / ٢٢١ ) رقم : ( ٢٠١٥ ) ، ومسلم رقم : ( ١١٦٥ ) .

[١٥٩] انظر التعليق السابق .

[١٦٠] تلاحى : تخاصم ، **واتە : دوو بەرەکی کردن .**

وَعَسَى أَنْ يَكُونَ خَيْرَاً لَكُمْ ، فَالْتَمِسُوهَا فِي التَّاسِعَةِ وَالسَّابِعَةِ وَالخَامِسَةِ (وفي رواية : في السَّبْعِ وَالتِّسْعِ وَالخَمْسِ " [١٦١] .

واتە : من هاتم بۆ ئەوەی هەواڵی ئەو شەوەتان پێ بدەم ، بەڵام لە بەر ئەوەی فلان و فلان دووبەرەكێیان كرد ، هەڵگیرا ، هیوام وایە ئەو كارە خێر بێ بۆتان ، جا بە دوایدا بگەرین لە نۆیەم ، و حەوتەم ، و پێنجەم ( وە لە ریوایەتێكی تردا : لە حەوت ، و نۆ ، و پێنج دا ) .

## بیر خستنەوەیەك :

هەندێك فەرموودەمان پێ گەشیتووە كە شەوی قەدر لە دە شەوی كۆتایدایە ، وە هەندێكی تر كە لە تاكەكانی دەی كۆتاییە ، یەكەمیان گشی یە و دووەمیان تایبەتە ، و تایبەتیش پێش دەخرێ لە سەر گشتی ، هەروەها هەندێك فەرموودە ئاماژە بەوە دەكەن كە لە حەوتەی كۆتایی بێ ، ئەمەش تایبەتە بە نەتوانین و لاوازیەوە و ئیشكالیش نیە لە نێوانیاندا ، لێرەدا فەرموودەكان یەك دەگرنەوە و دژ یەك نین ، وە كۆ دەبنەوە و بڵاوە ناكەن .

پوختەی ووتەیش ئەوەیە كە موسوڵمان بەدوای شەوی قەدردا دەگەڕێت لە تەكاكانی دەی كۆتایی ، شەوی بیست و یەك ، و بیست و سێ ، و بیست و پێنج ، و بیست و حەوت ، و بیست و نۆ ، وە ئەگەر لاواز بوو یان تواناى نەبوو ئەوا با لە تاكەكانی ئەو حەوتەی كە ماوە بە دوایدا بگەرێت : (شەوی بیست و پێنج ، و بیست و حەوت ، و بیست و نۆ ) ، خواش زاناترە .

## ٣ ـ چۆن موسوڵمان بەدوای ئەم شەوەدا بگەرێت ؟

ئەم شەوە پیرۆزە هەر كەسێك لە دەستی بچێ ، هەموو خێرێكی لە دەست چووە ، كەسیش لە دەستی ناچێ جگە لە بێ بەش نەبێ ، لە بەر ئەوە سوننەتە بۆ موسوڵمانی سور بوو لە سەر گوێرایەڵی خوای پەروەردگار ، ئەم شەوە زیندوو بكاتەوە بە باوەڕەوە بۆ بەدەست هێنانی پاداشتی گەورەی خوای پەروەردگار ، ئەگەر ئەوەی ئەنجام دا خوای پەروەردگار لەو تاوانانەی كردونیەتی خۆش دەبێ .

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : " مَنْ قَامَ لَيْلَةَ القَدْرِ إِيمَانَاً وَاحْتِسَابَاً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنبِهِ "[١٦٢] .

واتە : هەر كەسێ شەوی قەدر زیندو بكاتەوە و باوەڕی پێی هەبێ و چاوەڕێی پاداشتی خوا بێ ، خوا لە تاوانەكانی پێشووی خۆش دەبێ .

---

[١٦١] أخرجهُ البخاري : ( ٤ / ٢٣٢ ) رقم : ( ٢٠٢٣ ) و ( ٤٩ ) .

[١٦٢] أخرجهُ البخاري : ( ٤ / ٢١٧ ) رقم : ( ٢٠١٤ ) ، و مسلم رقم : ( ٧٥٩ ) .

سوننەتیشە لەو شەوەدا پاڕانەوە زۆر بکرێت ، چونکە لە دایکە (**عائشة**) وە - ڕەزای خوای لێبێت - دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی : " ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر زانیم چ شەوێك شەوی قەدرە ، چی بڵێم لەو شەوەدا ؟ فەرمووی : بڵێ : **اللهُمَّ إِنَّكَ عَفُوٌّ تُحِبُ الْعَفْوَ فَاعْفُ عَنِّي** " [(١٦٣)]. واتە : خوایە تۆ لێ بوردەیت و لیبوردنت خۆش ئەوێ ، لێم ببورە .

برام - خوای پەروەردگار بەرەکەتی خۆیت بەسەردا برێژێت و سەرکەوتووت کات بۆ گوێڕایەڵی خۆی - کە زانیت ئەم شەوە چ شەوێکی گەورەیە ، کەوابوو دە شەوی کۆتایی هەستە و زیندووی بکەرەوە بە پەرستن و دورکەوتنەوە لە ئافرەتان ، و فەرمان بکە بە خێزانەکەت بەو شتانە و پەرستنی زیاتر بکە لەم شەوەدا .

لە (**عائشة**)وە - ڕەزای خوای لێبێت - دەگێڕنەوە ، فەرموویەتی: "**كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا دَخَلَ الْعَشْرُ شَدَّ مِئْزَرَه** [(١٦٤)] ، **وأَحْيَى لَيْلُهُ ، وَأَيْقَظَ أَهْلَهُ** " [(١٦٥)].

واتە : پێغەمبەر ﷺ ئەگەر دە شەوی کۆتای بهاتبایە پشتی لێ دەبەست ( واتە : دوور ئەکەوتەوە لە جووت بوون لە گەڵ خێزانەکانیدا ) و شەوەکانی زیندو دەکردەوە خێزانەکانیشی بە خەبەر دەهێنا .

هەروەها لە ( **عائشة** ) وە دەگێڕنەوە فەرموویەتی : " **كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَجْتَهِدُ فِي العَشْرِ الأَوَاخِرِ مَا لا يَجْتَهِدُ فِي غَيْرِهَا** " [(١٦٦)] .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ لە دە ڕۆژی کۆتایدا زیاتر هەوڵی خواپەرستی دەدا بە شێوەیەك ئەو هەوڵەی لە ڕۆژانی تردا نەدەدا .

## ٤ - نیشانەکانی ئەم شەوە :

بزانە ئەی بەندەی گوێڕایەڵ - خوای پەروەردگار یارمەتێت بدات بەڕەحمی خۆی و پشتوانیشت بێ بەسەرکەوتنی خۆی - کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەمەو بەیانی ئەم شەوەی بۆ وسف کردووین ، بۆ ئەوەی موسوڵمان بزانێت ئەم شەوە چ شەوێکە [(١٦٧)] :

---

(١٦٣) أخرجهُ الترمذي رقم : ( ٣٧٦٠ ) ، وابن ماجه رقم : ( ٣٨٥٠ ) عن عائشة . وسندهُ صحيحٌ .

وراجع لشرحه : ( بغية الإنسان في وظائف رمضان ) ص : ( ٥٥ — ٥٧ ) لابن رجب الحنبلي .

(١٦٤) واتە : دور ئەکەوتەوە لە ئافرەت بە مەبەستی خوا پەرستن ، وە قۆڵی بۆ هەڵ دەکرد و بە دوایدا دوگەڕا .

(١٦٥) أخرجهُ البخاري : ( ٤ / ٢٣٣ ) رقم : ( ٢٠٢٤ ) ، و مسلم رقم : ( ١١٧٤ ) .

(١٦٦) أخرجهُ مسلم رقم : ( ١١٧٤ ) .

(١٦٧) خەڵکی عەوام ( نە شارەزا لە دین ) زۆر نیشانەیان هەیە دەربارەی شەوی قەدر و هەمووشی خورافی و بیر و باوەڕی پوچەڵن ، لەوانە : دارەکان سوجدە دەبەن ، وە خانوەکان دەخەون (!) و ... و ... هتد.

لە ( **أُبَـيّ بـن كعـب** ) ەوە ﷺ دەگێڕنـەوە كـە فەرموویـەتی : پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی : " صَبِيحَةُ لَيْلَةِ الْقَدْرِ تَطْلُعُ الشَّمسُ لا شُعَاعَ لَهَا ، كَأَنَّهَا طَسْتٌ حَتَى تَرْتَفِعَ " (١٦٨) .

واتە : بەرە بەیانی شەوی قەدر خۆر هەڵدێت و تیشكی نیە ، هـەروەكو تەشـتێك تـا ئـەو كاتـەی بەرز دەبێتەوە .

وە لە ( **أبـو هريـرة** ) وە ﷺ دەگێڕنـەوە فەموویـەتی : باسـی شـەوی قـەدرمان دەكـرد لـە لای پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : " أَيُّكُم يَذْكُرُ حِيْنَ طَلَعَ الْقَمَرُ ، وَهُوَ مِثْلُ شِقّ جَفْنَةٍ " (١٦٩) .

واتە : كامەتان لە یادێتی كاتێ مانگ دەركەوت وەكو نیوەی قاپێك بوو .

وە لە (**ابن عباس**)ەوە ـ ڕەزای خوا لە خۆی و باوكی بێت ـ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی : " لَيْلَةُ الْقَدْرِ سَمْحَةٌ ، طَلِقَةٌ ، لا حَارَّة ، وَلا بَارِدَة ، تُصْبِحُ الشَّمْسُ صَبِيْحَتَهَا ضَعِيْفَةً حَمْرَاء " (١٧٠) .

واتە : شەوی قەدر شەوێكی بێ دەنگ و ڕوونە ، نە گەرمە و نەسارد ، خۆری بەیانیەكـەی لاواز و سور دەبێ .

## مانەوە لە مزگەوت بۆ خوا پەرستن

## (( الإعتكاف ))

### ١ ـ حیكمەتی مانەوە لە مزگەوت خوا پەرستنە :

پێشەوا ( **العلامة ابن القيم** ) فەرموویەتی : (( لـە كاتێكـدا كـە چـاك كردنـەوەی دڵ و بـەردەوام بوون لە سەر ڕێگەی بەرەو خوا چوون ( واتە : بـۆ خـوا سـوڵحان ) وەسـتاوە لـە سـەر كـۆ كردنـەوەی بەرەو خوا ، و كۆ كردنەوەی بڵاو بووەكانی و بەتەواو ڕووتێ كردنی بەرەو خوای پەروەردگار ، چـونكە بڵاوبووەكانی دڵ هێچ كۆی ناكاتـەوە جگـە لـە ڕوو كردنـە خـوای پـەروەردگار نـەبێ ، لـە بـەر ئـەوەی زیادەی خواردن و خواردنەوە و زیادەی تێكـەڵ بـوون لەگـەڵ خـەلك دا ، و زیـادەی ووتـن ، و زیـادەی

---

منیش دەڵێم : لە كوردستانی خۆشمان هەندێ لەو خورافەت و بیر و باوەڕە پوچەڵانە لە لای خـەڵكی عـەوام باسـی لـێ وە دەكرێت ، لەوانە : لەم شەوەدا ئەستێرە داناچۆڕێت و سەگەكان ناوەڕن و ... و ... هتد ، كە هەمووی ووتەی پوچەڵ و بێ بەڵگـەن و هیچ بنەوایەكیان نیەیە لە ئایینی ئیسلامی پیرۆزدا .

(١٦٨) أخرجهُ مسلم رقم : ( ٧٦٢ ) .

(١٦٩) أخرجهُ مسلم رقم : (١١٧٠) .

وە (شِقّ جَفْنَة) : الشِقّ : واتە : نیو ، الجَفْنة : واتە : قاپ ، وە (القاضي عياض) دەفەرمووێ : (لەم فەرموودەیەدا ئاماژەكراوە بۆ ئـەوەی كـە لە كۆتای مانگدا ئاوا دەبێت ، چونكە مانگ بەو شێوەیە نابێت لە كاتی دەركەوتنیدا جگە لە كۆتای مانگ نەبێت) .

(١٧٠) أخرجهُ الطيالسي رقم : (٣٤٩) ، وابن خُزَيمة : (٢٣١/٣) ، والبزار : (٤٨٦/١) ، و سندهُ حَسَنٌ .

خەوتن کردارەکانی دڵیان بەر بەڵاوتر دەکرد ، و بەڵاوەیان پێ دەکرد بە هەموو دۆڵەکاندا ، وە دەیبڕی لە ڕۆیشتن بەرەو لای خوای پەروەردگار یان لاوازی دەکات یان کۆسپی دەخاتە ڕێی و لە کاری دەخات .

میهرەبانێتی خوای بە توانا و میهرەبان بەرامبەر بە بەندەکانی ئەوەی کرد ڕۆژووی لە سەر فەرز کردن کە هۆی نەهێشتنی زیادەی خواردن و خواردنەوەیە ، دڵیش بەتاڵ دەکات لە ئارەزووەکانی کە هۆی لە کارخستنێتی لە بەردەوام بوونی لە سەر ڕێگەی بەرەو خوا چوون ، فەرز کردنەکەش بەپێی قازانج بووە بە شێوەیەك بەندە سوودی لێ وەربگرێت لە دونیا و دواڕۆژیش دا ، و زیانیشی پێ نەگەیەنی و نەشی بڕێ لە قازنجە پێش وەخت و دوا خراوەکانی .

هەروەها ڕێی پێدان بەمانەوە لە مزگەوت بۆ خوا پەرستن ، ئەوەی کە مەبەست و ناوەڕۆکەکەی مانەوەی دڵە لەسەر ڕێگەی خوای پایە بەرز و کومەڵ بوونێتی لە سەری و تاك بوونی لەگەڵیدا ، وە بۆ بڕان لە خۆ خەریك کردنی بە خەڵکەوە ، و خۆ خەریك کردنی تەنها بە خوای بێگەردەوە ، بە شێوەیەك یاد کردن و خۆشەویستی و ڕوو کردنە خوا جێگای ویستەکانی دڵ و ساتەکانی دەبێ ، بەوەیش دەست بەسەر دڵدا بگرێت بە هۆی ملکەچی دڵەوە ، بەمەش ویستەکانی هەمووی بە خوایەو هەموو ساتەکانیشی بەیادی ئەوە ، و بیرکردنەوەشی تەنها لە ئەنجام دانی ئەو کردارانەیە کە ڕازی بوونی خوای پێ بەدەست دێ و لە خوا نزیکی دەکاتەوە ، ئەو کاتە هاودەمێتی بە خوا دەبێ لە جیاتی ئەوەی خەڵکی بێ ، دووریشی لەوە لەبەر هاودەمێتیەتی لە ڕۆژی تەنهایی لە ناو گۆڕدا لە کاتێکدا هیچ هاودەمێك نیە ، وە هیچ دڵ پێخۆشکراویك نیە جگە لەو نەبێ ئەمەیە مەبەست لە مانەوەی گەورە لە مزگەوت )) [١٧١] .

## ٢ ـ واتاکەی :

(**الإعتكاف**) : مانەوەیە لە سەر شتێك ، لە بەر ئەمەش بەو کەسەی کە لە مزگەوت دەمێنێتەوە بۆ خوا پەرستی ووتراوە : (**معتكف**) و (**عاكف**) [١٧٢].

## ٣ ـ ڕێ پێ دانی :

لە هەموو ڕۆژەکانی ساڵ دا سوننەتە لە ڕەمەزان بێ یان جگە لە ڕەمەزان ، چونکە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە لە دە ڕۆژی کۆتای شەوال دا ماوەتەوە لە مزگەوت بۆ خوا پەرستی [١٧٣] .

---

[١٧١] زاد المعاد : ( ٢ / ٨٦ ــ ٨٧ ) .

[١٧٢] المصباح المنير : ( ٢ / ٤٢٤ ) للفيومي ، و ( لسان العرب ) : ( ٩ / ٢٥٢ ) لابن منظور .

وە دەگێڕنەوە لە ( **عمر** ) ەوە ﷺ بە پێغەمبەری فەرمووە ﷺ : " **يَا رَسُولَ اللهِ إِنِّي كُنْتُ نَذَرْتُ فِي الجَاهِلِيَّةِ ، أَنْ أَعْتَكِفَ لَيْلَةً فِي المَسْجِدِ الحَرَامِ ؟ قَالَ : فَأَوْفِ بِنَذْرِكَ فَاعْتَكِفْ لَيْلَةً** " [١٧٤] .

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من لە سەردەمی نەفامیدا نەزرم کرد بوو شەوێك لە مزگەوتیماڵی خوادا ، واتە : ( **مسجد الحرام** ) بمێنمەوە ؟ فەرمووی : وەفا بکە بە نەزرەکەت ( شەویك لە مزگەوت بمێنەوە ) .

وە باشترینی لە ڕەمەزاندا دەبێ ، لە بەر فەرموودەی ( **أبو هريرة** ) ﷺ کە دەفەرموێت : " **كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَعْتَكِفُ فِي كُلِّ رَمَضَان عَشْرَةَ أَيَّامٍ فَلَمَّا كَانَ العَامُ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ أعْتَكَفَ عَشْرِيْنَ يَوْمَاً** " [١٧٥] .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو ڕەمەزانێك دە ڕۆژ لە مزگەوت دەمایەوە ، بەڵام کاتێك ئەو ساڵەی کە تێیدا وەفاتی کرد بیست ڕۆژ مایەوە .

وە باشترینیشی لە کۆتایی ڕەمەزاندایە چونکە پێغەمبەر ﷺ : " **كَانَ يَعْتَكِفُ العَشْرَ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَان حَتَّى تَوَفَّاهُ اللهُ عزَّ وَجَل** " [١٧٦] .

## ٤ ـ مەرجەکانی :

**أ ـ** دروست نىیە جگە لە مزگەوتەکان نەبێ لە بەر ووتەی خوای پایە بەرز : ﴿وَلَا تُبَاشِرُوهُنَّ [١٧٧] وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ﴾ [البقرة : ١٨٧].

**ب ـ** ( **المساجد** ) : ووشەی مزگەوتەکان بەڕەهایی ( واتە : **مطلق** )ی نیە ، چونکە فەرموودەی ( **صحيح** ) مان لە سوننەت داپێگەشیتووە بۆ (**تقيد**) کردنی ، ئەوەش ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرە ﷺ کە فەرموویەتی : " **لا اعْتِكَافَ إِلا فِي المَسَاجِدِ الثَّلاثَةِ** " [١٧٨] .

واتە : مانەوە لە هیچ مزگەوتێکدا نىیە بۆ خوا پەرستی ، جگە لە سێ مزگەوتەکە نەبێ .

---

[١٧٣] أخرجهُ البخاري : ( ٤ / ٢٢٦ ) رقم : ( ٢٠٤١ ) ، و مسلم رقم : ( ١١٧٣ ) .

[١٧٤] أخرجهُ البخاري : ( ٤ / ٢٣٧ ) رقم : ( ٢٠٤٢ ) ، و مسلم رقم : ( ١٦٥٦ ) .

[١٧٥] أخرجهُ البخاري : ( ٤ / ٢٤٥ ) رقم : ( ٢٠٤٤ ) .

[١٧٦] أخرجهُ البخاري : ( ٤ / ٢٢٦ ) رقم : ( ٢٠٢٦ ) ، و مسلم رقم : ( ١١٧٣ ) عن عائشة .

[١٧٧] أي : لا تُجامعوهُنَّ ، كما هو قول الجمهور . انظر ( زاد الميسر ) : ( ١ / ١٩٣ ) لابن الجوزي . **واتە : جووت مەبن لە گەڵ خێزاندا ، وە ئەمەیش ووتەی زۆرینەی زانایانە .**

[١٧٨] وهو حديثٌ صحيحٌ ثابتٌ ، صحَّحهُ الأئمة والعلماء ، راجع لتخريجه والكلام فيه ، والرد على ما أثارهُ (البعضُ) : رسالة : ( الإنصاف في أحكام الإعتكاف ) تأليف : علي حسن علي عبد الحميد ، طبع : المكتبة الإسلامية ، وانظر لزيادة البيان (جزء الإعتكاف) للحمّامي ، بتحقيقه وتخريجه ، وهو تحت الطبع .

ج ـ سوننەتیش لە سەر ئەوەیە بۆ ئەو کەسانەی کە لەمزگەوت دەمێننەوە بەڕۆژوو بن هەروەکو لەپێشدا باسکرا لە ( **عائشة** ) وە ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ [١٧٩].

## ٥ ـ چی ڕەوایە بۆ ئەو کەسەی لە مزگەوت دەمێنێتەوە بۆ خوا پەرستن :

**أ** ـ بۆی ڕەوایە دەرچێت بۆ پێویستیەکانی ، یان سەری لە مزگەوتەوە دەرکات بۆ ئەوەی بشۆررێت و پرچی دا بهێنرێت ، ( **عائشة** ) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ فەرموویەتی : " وَإِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ لَيُدْخِلُ عَلَيَّ رَأْسَهُ وَهُوَ [ مُعْتَكِفٌ ] فِي المَسْجِدِ [ وَأَنَا فِي حُجْرَتِي ] فَأُرَجِّلَهُ (وفي رِوَايَةٍ : فَأَغْسِلُهُ) [ وَإِنَّ بَيْنِي وَبَيْنَهُ لَعَتَبَةُ البَابِ ][ وَأَنَا حَائِضٌ ] وَكَانَ لا يَدْخُلُ البَيْتَ إِلا لِحَاجَةِ [ الإِنْسَانِ ] إِذَا كَانَ مُعْتَكِفاً " [١٨٠].

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ سەری ئەهێنایە ژوورەوە بۆ لام لە کاتێك دا کە لە مزگەوت دەمایەوە منیش لە ژووری خۆم بووم پرچم بۆ دا دەهێنا یان ئەمشوشت تەنها بەردەرگاکەمان لە نێواندا بوو لە کاتێك دا لە بێنوێژی دەبووم ، و نەدەهاتە ماڵەوە جگە لە کاتێکدا نەبێ کە نیازی چونە سەر ئاوی هەبێ .

**ب** ـ وە ڕاوەیە بۆ کەسێك کە لە مزگەوت مابێتەوە بە مەبەستی خوا پەرستی یان بۆ هەر شتێکی تر لە مزکەوت دا دەست نوێژ بشوات لە بەر ووتەی پیاوێك کە خزمەتی پیغەمبەری کردووە ﷺ دەفەرمۆی : " تَوَضَّأَ النَّبِيُّ ﷺ فِي المَسْجِدِ وُضُوءً خَفِيْفَاً " [١٨١] .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ دەست نوێژێکی سوکی لە مزگەوت دا شوشت .

**ج** ـ وە بۆی ڕەوایە خێمەیەکی بچوك هەڵدات لە کۆتای مزگەوت دا بۆ ئەوەی تێیدا بمێنێتەوە بۆ خوا پەرستن ، چونکە ( **عائشة** ) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ ( **خباء** ) یك [١٨٢] ، واتە : خێمەیەکی بۆ پێغەمبەر ﷺ هەڵدەدا ، ئەگەر لە مزگەوت بمایەتەوە بۆ خوا پەرستن ، ئەوەش بەفەرمانی پێغەمبەر بوو ﷺ [١٨٣].

**د** ـ وە بۆی ڕەوایە جێگە خەوەکەی یان تەختی خەوتنەکەی لەو خێمەدا دابنێ ، لە بەر ئەوەی کە لە ( **ابن عمر** ) ەوە دەیگێڕنەوە ـ ڕەزای خوا لە خۆی و بابی بێت ـ لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە ئەگەر

---

[١٧٩] أخرجهُ عبد الرزاق في (المُصنَّف) رقم : (٨٠٣٧) . وروى رقم : (٨٠٣٣) بمعناه عن ابن عمر وابن عباس رضي الله عنهم.

[١٨٠] أخرجهُ البخاري : ( ١ / ٣٤٢ ) ، و مسلم رقم : ( ٢٩٧ ) . و انظر ( مختصر صحيح البخاري ) رقم : ( ١٦٧ ) لشيخنا الألباني ، و ( جامع الأصول ) : ( ١ / ٣٤١ ) لابن الأثير .

[١٨١] أخرجهُ أحمد : ( ٥ / ٣٦٤ ) ، بسندٍ صحيح .

[١٨٢] الخباء : خێمەیەکی بچوکە لە تووك یان لە صوف دروست دەکرێت ، دوو کۆڵکە یان سێ کۆڵەی هەیە .

[١٨٣] كما في ( صحيح البخاري ) : ( ٤ / ٢٢٦ ) رقم : ( ٢٠٣٣ ) .

لە مزگەوت بمایەتەوە جێگە خەوێکی بۆ دادەنرا یان تەختی خەوتنێکیان بۆ دادەنا لە پاش کۆڵەکەی تەوبەوە ( **إسطوانة التوبة** ) (١٨٤).

## ٦ ـ مانەوەی ئافرەت لە مزگەوتدا بۆ خوا پەرستی و سەردانی مێردەکەی لە مزگەوت :

**أ ـ** ڕەوایە بۆ ئافرەت سەردانی مێردەکەی بکات لە کاتێك دا پیاوەکەی

لە مزگەوت دا مابێتەوە بۆ خوا پەرستن ، وە بۆ پیاوەکەشی ڕەوایە ئافرەتەکەی تا دەرگای مزگەوت ڕەوانە بکات (١٨٥) ، (**صفية**) خێزانی پێغەمبەر ﷺ ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ فەرموویەتی : "كَانَ النَّبِيُّ ﷺ مُعتكفاً [في العشرِ الأواخرِ مِنْ رمضان] فأتيتُهُ أزوره ليلاً ، [وعنده أزواجه فَــرُحْنَ ] ، فَحَدَّثْتُهُ ساعةً ، ثُمَّ قمتُ لأنقلبَ ، [فقالَ : لا تَعْجَلي حَتَّى أنْصَرِفُ معكِ] ، فقامَ معي لِيَقْلِبَنِي (١٨٦) ، ـــ وكانَ مسكنها في دارِ أسامةَ بن زيد ـــ [حَتَّى إذا كانَ عندَ بابِ المسجدِ الذي عندَ باب أُمِّ سلمة ، فَمَــرَّ رجلانِ مِنَ الأَنصارِ ، فَلَمَّا رأيا النَّبِيَّ ﷺ أَسْرَعَا ، فقالَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى رِسْلِكُمَا (١٨٧) إِنَّها صفيةُ بنتِ حُيي ، فقالا: سُبحانَ اللهِ يَا رسولَ اللهِ ، قالَ : إنَّ الشَّيطانَ يجري مِن ابنِ آدم مَجْرَى الــدَّمِ وَإِني خَــشِيْتُ أَنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُمَا شَرَّاً ـــ أو قالَ ـــ شَيْئَاً " (١٨٨).

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەی کۆتایی ڕەمەزاندا مابووەوە بۆ خوا پەرستی ، منیش بەشەو هاتم بۆ سەردانی ، لەو کاتەدا خێزانەکانی لەلای بوون و ڕۆشتن ، ماوەیەك لە گەڵیدا دووام ، پاشان هەستام بگەڕێمەوە ، فەرمووی : پەلە مەکە بۆ ئەوەی لە گەڵت بیم ، لە کاتێکدا کە لە لای دەرگای مزگەوت بووین لە لای دەرگای ماڵی ( **أم سلمة** ) وە دوو پیاو لە ئەنصار تێپەر بوون ، کاتێك پیغەمبەریان بینی ﷺ پەلەیان کرد ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : پەلە مەکەن ئەوە ( **صفية بنت حيي** ) ە ، فەرموویان : ( سُبْحَانَ اللهِ ) ئەی پێغەمبەری خوا ! فەرمووی : " شەیتان بەناو ڕێڕەوی خوێنی نەوەکانی ئادەم دا دێت و دەڕوات منیش ترسام خراپەیەك یان شتێك بخاتە دڵتانەوە " .

**ب ـ** وە ڕەوایە بۆ ئافرەت لە مزگەوت بمێنێتەوە بۆ خوا پەرستن لەگەڵ مێردەکەیدا ، یان بە تەنهایی لە بەر فەرموودەی ( **عائشة** ) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ کە دەگێڕێتەوە : پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١٨٤) كما في ( صحيح مسلم ) رقم : ( ١١٧٣ ) .

(١٨٥) أخرجهُ ابن ماجه رقم : ( ٦٤٢ ـــ زوائده ) ، و البيهقي ـــ كما قال البوصيري ـــ من طريقين عن عيسى بن عمر ، عن نافع ، عن ابن عمر .

(١٨٦) واتە : دەمیگەڕاندەوە و خۆیشی لە گەڵمدا دەهات .

(١٨٧) أي : مهلاً ، لا تعجلا في الذهاب ، فليس هذا شيئاً تكرهانه !

واتە : لە سەر خۆ بن ، پەلە مەکەن ، چونکە ئەمە شتێك نیيە پێتان ناخۆش بێت .

(١٨٨) أخرجهُ البخاري : ( ٤ / ٢٤٠ ) رقم : ( ٢٠٣٥ ) و ( ٢٠٣٨ ) و مسلم رقم : ( ٢١٥٧ ) ، و الزيادة الأخيرة لأبي داود : ( ٧ / ١٤٢ ـــ ١٤٣ عون المعبود ) .

لە مزگەوت دەمایەوە لە دەی کۆتای ڕەمەزاندا تا کاتێ وەفاتی کرد ، پاشان خێزانەکانی لە دوای خۆی لە مزگەوت دەمانەوە (١٨٩) .

شێخمان خوا بیپارێزێ ❁ فەرموویەتی : (( ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لە سەر ڕەوایی مانەوەی ئافرەت لە مزگەوت بۆ خوا پەرستن ، وە گومانیش لەوەدا نیە کە پابەندە بە ڕێپێدانی خاوەنەکانیان بۆ ئەو کارە و نەبوونی فیتنە ، و نەبوونی خەڵوەت لەگەڵ پیاواندا ، لە بەر ئەو بەڵگە زۆرانەی کە هەن لە سەری ، و بنەوا فیقهیەکەش : [ دَرْءُ المَفَاسِدِ مُقَدَّمٌ عَلَى جَلْبِ المَصَالِح ] واتە : پاڵنانی خراپەکان پێش خراوە لە سەر بەدەست هێنانی چاکەکان )) ا. هـ .

## نوێژی تەراویح :

### ١ ـ ڕێپێدانی ( مشروعيتهُ ) :

کردنی نوێژی تەراویح بە جەماعەت دورستە لە بەر ئەو فەرموودەیە کە ( **عائشة** ) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەیگێڕێتەوە : " أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ خَرَجَ فِي جَوْفِ الليلِ فَصَلَّى فِي المَسْجِدِ ، وَصَلَّى رِجَالٌ بِصَلاتِه ، فَأَصْبَحَ النَّاسُ فَتَحَدَّثُوا ، فَاجْتَمَعَ أَكْثَرُ مِنْهُم ، فَصَلَّى فَصَلُّوا مَعَهُ ، فَأَصْبَحَ النَّاسُ فَتَحَدَّثُوا فَكَثُرَ أَهْلُ المَسْجِدِ مِنَ الليلةِ الثَّالثَةِ فَخَرَجَ رسولُ اللهِ ﷺ فَصَلَّى بِصَلاتِه ، فَلَمَّا كَانَتْ الليلةُ الرابعةُ عَجَزَ المسجدُ عَنْ أهلِه حَتَّى خَرَجَ لِصَلاةِ الصُّبْحِ ، فَلَمَّا قَضَى الفَجْرَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَتَشَهَّدَ ثُمَّ قالَ : " أَمَّا فَإِنَّه لَمْ يَخْفَ عَلَيَّ مَكَانَكُم وَلكني خَشِيْتُ أنْ تُفْرَضَ عَلَيْكُم فَتَعْجزُوا عَنْهَا " ، فَتُوفِّيَ رَسولُ اللهِ ﷺ وَالأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ (١٩٠).

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناوەندی شەودا دەرچوو نوێژی لە مزگەوتدا کرد ، هەندی لە پیاوان بە نوێژەکەی ئەوەوە نوێژیان کرد ، کە ڕۆژ بووەوە خەڵکی باسیان لێوە کرد ، لە شەوی دووەمدا لەوان زیاتر کۆ بووەوە ، پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد و خەڵکیش لە گەڵیدا ، کە ڕۆژ بووەوە خەڵکی دیسان باسیان لێوە کرد ، و خەڵکی ناو مزگەوتەکە زۆر تر بوو لە شەوی سێیەم ، کە پێغەمبەر ﷺ دەرکەوت نوێژیان کرد بە نوێژەکەیەوە ، بەڵام کە شەوی چوارەم بوو مزگەوت ڕێی خەڵکی نەدەکردەوە ، پێغەمبەر ﷺ دەرنەچو لە ماڵ تا کاتی نوێژی بەیانی ئەنجا دەرچو بۆ نوێژی بەیانی ، وە کاتێ نوێژی بەیانی ئەنجامدا ڕووی تێ کردن و شایەتمانی هێناو پاشان فەرمووی : "

---

(١٨٩) تقدم تخريجهُ في التعليق رقم : (١٧٥) .

❁ ئەم کتێبە لە کاتێکدا نووسراوەتەوە کە فەرمووده ناسی سەردەم شێخی ( **محمد ناصر الدين الألباني** ) لە ژیاندا بووە ، بۆیە نووسەرەکان فەرموویانە : خوا بیپارێزێت ، بەڵام ئێستا کە وەفاتی کردووە دەڵێین : ڕەحمەتی خوای لێبێت و بە بەهەشتی پان و بەرینی خۆی شادی بکات ، ـ **آمين** ـ

(١٩٠) أخرجهُ البخاري : ( ٣ / ٢٢٠ ) رقم : ( ٩٢٤ ) و ( ٢٠١٢ ) ، و مسلم رقم : ( ٧٦١ ) .

سەربارەت بە من جێگای ئێوە شاراوە نەبوو لێم ( واتە : من ئاگادارم بووم کە ئێوە هاتوون بۆ مزگەوت ) ، بەڵام لەوە ترسام لە سەرتان فەرز بێت و پێتان ئەنجام نەدرێ " وە پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد و کار هەر لە سەر ئەوە بوو .

بەڵام کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە بۆ لای خوای پەروەردگار خۆی و شەریعەت جیگیر بوو ، و ترسی فەرز بوونی نەما ، وە ڕێ پێدانی کردنی نوێژەکەی بە جەماعەت مایەوە بە هۆی نەمانی هۆکارەکەی ، چونکە هۆکار دەسورێتەوە لە گەڵ کرداردا بە بوونی و نەبوونی [ العِلَّةُ تَدُورُ مَعَ المَعْلُولِ وُجُودَاً وَعَدَمَاً ] .

تا خەلیفەی هۆشمەند و کارامە و لێهاتوو ( **عمر بن الخطاب** ) رضي الله عنه ئەم سوننەتەی زیندو کردەوە هەر وەکو چۆن ( عبد الرحمن بن عبدٍ القاريُّ )[191] دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێ : " لە گەڵ ( **عمر بن الخطاب** ) دا رضي الله عنه دەرچووم بۆ مزگەوت شەویك لە ڕەمەزاندا بینمیان خەڵکی کۆمەڵ کۆمەڵ جیاوازن ، پیاوی وا هەبوو بۆ خۆی نوێژی دەکرد ، وە پیاوی واش هەبوو کۆمەڵێك لە گەڵیدا نوێژیان دەکرد ، جا ( **عمر** ) : فەرمووی : من وا ئەبینم ئەگەر ئەوانە لە سەر یەك قورئان خوێن کۆ بکرێنەوە باشترە ، پاشان ئەمە لە دڵدا جێگیر بوو و لە سەر ( **أُبي بن كعب** ) کۆی کردنەوە ، پاشان لە شەوێکی تردا لە گەڵێدا دەرچووم و خەڵکیش بە نوێژی قورئان خوێنەکەیان نوێژیان دەکرد ، ( **عمر** ) فەرمووی : ئەمە باشترین بیدعەیە * ، وە ئەو نوێژەی کە لە سەری دەخەون ( واتە : دوای هەستان لە خەو نوێژی تەراویح بکات ) چاکترە لەوەی کە یەك سەری پێی هەڵ دەستن ( دوای نوێژی عیشا ) ، جا خەڵکی لە سەرەتای شەودا ( واتە : دوای نوێژی عیشا ) هەڵدستان بۆ نوێژی تەراویح [192] .

---

[191] بتنوين ( عَبْدٍ ) ، و ( القاريُّ ) مشددة الياء ــ دون إضافة ــ انظر ( اللباب في تهذيب الأنساب ) : (٣ / ٦ ــ ٧ ) لابن الأثير .

* **برای موسوڵمان :**

**أ -** مەبەستی عمر رضي الله عنه لە ڕستەی " **نعمت البدعة هذه** " ئەوە نییە کە کردارەکەی عمر رضي الله عنه بیدعە بێت لە زاراوەی شەرعدا ، چونکە هەر وەکو ئاشکرایە بیدعە : شتێکی تازەیە دەخرێتە سەر ئاینی ئیسلامی پیرۆز و هیچ بنەوایەکی لە قورئان یان لە سوننەتەکانی پێغەمبەردا ﷺ نییە ، بەڵام کردەوەکەی عمر رضي الله عنه بنەوای هەیە لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ بەڵام لە ترسی فەرز بوونی وازی لێهێناوە ، وە کە ترسی فەرز بوونی نەما عمر رضي الله عنه ئەو سوننەتەی زیندوو کردەوە.

**ب -** بە کار هێنانی زاراوەی ( **بیدعة** ) لە لایەن عمرەوە رضي الله عنه بەکار هێنانێکی زمانەوانیە و هیچی تر ، جا بە ئاگە بە لە ووتەی ئەو کەسانەی کە دەڵێن : ئەمە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە ( **بیدعەی حەسەنە** ) لە ئاییندا هەیە **!!!**

چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " كُلُّ بدعةٍ ضلالة ، وكل ضلالة في النار " . خوای پەروەردگار پارێزەری من و ئێوەیش بێت لە گومڕایی و گومڕا بووان و گومڕاکەران .

بڕوانە کتێبی : ( **علم أصول البدع** ) ل : ( ١٢٦ ــ ١٢٩ ) نووسینی : **علي حسن الحلبي** ، و ( **البدعة وأثرها السيء في الأمة** ) ل : ( ٢٢ - ٢٤ ) نووسینی : **سليم الهلالي** .

[192] أخرجهُ البخاري : ( ٤ / ٢١٨ ) رقم : ( ٢٠١٠ ) ، والزيادة لمالك : ( ١ / ١١٤ ) ، وعبد الرزاق رقم : ( ٧٧٢٣ ) .

## ٢ ـ ژمارەی ڕکاتەکانی :

خەڵکی جیاوازن لە دیاری کردنی ڕکاتەکانی ، ووتەی گونجا و بۆ ڕێنمووی پێغەمبەر محمد ﷺ ئەوەیە کە هەشت رکات بێ جگە لە ویترەکان ، لە بەر فەرموودەی ( **عائشة** ) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ کە فەرموویەتی : " مَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَزِيْدُ فِي رَمَضَانَ وَلاَ فِي غَيْرِهِ عَلَى إِحْدَى عَشْرَةَ رِكْعَةٍ " [١٩٣] .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ لە یازدە رکات زیاتری نەدەکرد لە ڕەمەزاندا و جگە لە ڕەمەزانیش دا .

ووتەکەی ( **عائشة** ) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لە گەڵ فەرموودەی (**جابر بن عبدالله**) دا ﷺ یەك دەگرنەوە ، کە دەگێڕێتەوە : " أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَحْيَى بِالنَّاسِ لَيْلَةً فِي رَمَضَان ، صَلَّى ثَمَانِي رَكَعَاتٍ وَأَوْتَرَ " [١٩٤] .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێکی ڕەمەزانی زیندوو کردەوە لە گەڵ خەڵکدا هەشت رکات نوێژی کردوو پاشان ویترەکانی کرد .

هەروەها کاتێك ( **عمر بن الخطاب** ) ئەم سوننەتەی زیندوو کردەوە خەڵکی لە سەر یازدە رکات کۆ کردەوە بە پێی سوننەتی ( **صحيح** ) هەر وەکو ئیمامی ( **مالك** ) : ( ١ / ١١٥ ) بە ( **سَنَد** ) ێکی ( **صحيح** ) لە ڕێگەی ( **محمد بن يوسف** ) لە ( **السائب بن يزيد** ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی : " ( **عمر بن الخطاب** ) فەرمانی بە ( **أُبي بن كعب** ) و ( **تميم الداريّ** ) کرد کە پێش نوێژی خەڵکی بکەن بە یازدە رکات ، فەرمووی : قورئان خوێنەکان لە سورەتە (١٠٠) سەد ئەیەتیەکانیان دەخویندەوە ، بە شێوەیەك خۆمان بە گالۆکەکانەوە ڕادەگرد لە بەر درێژی وەستان ، و وبڵاوەمان لێ نەدەکرد تا کاتی سەرەتای دەرکەوتنی فەجر " .

وە ( **يزيد بن خصيفة** ) پێچەوانە یەتی و فەرموویەتی " بە بیست رکات " بەڵام ئەمە ( **شاذة** ) چونکە ( **محمد بن يوسف** ) ( **أوثق** ) ترە لە (**يزيد بن خصيفة**) ، وە بە هاوشێوەکانی ئەمە ناوترێت ( **زيادة الثقة** ) یە کە وەردەگیرێ ، چونکە ( **زيادة الثقة** ) پێچەوانە کردنی تێدا نیە ، بەڵکو زیادەی ( **علم** ) ی تێدایە لە سەر ئەوەی کە ( **ثقة** ) ی یەکەم گێراویەیتەوە ، هەروەکو لە ( **فتح المغيث** ) دا : ( ١ / ١٩٩ ) هاتووە وە لە (**محاسن الاصطلاح**) دا : ( ص ١٨٥ ) وە لە ( **الكفاية** ) دا : ( ص ٤٢٤ ـ

---

[١٩٣] أخرجهُ البخاري : ( ٣ / ١٦ ) رقم : ( ١١٤٧ ) و ( ٢٠١٣ ) ، ومسلم رقم : ( ٧٣٦ ) .

قال الحافظ ـ رحمه الله ـ في (الفتح) (٤/٥٤) : ((**هذا مع كونها أعلم بحال النبي ﷺ ليلاً من غيرها**)) . **واتە : ئەمە لە گەڵ ئەوەیشدا کە زاناترین کەسە بە حاڵی پێغەمبەر ﷺ لە شەودا لە جگە لە خۆی .**

[١٩٤] أخرجهُ لبن حبان في ( صحيحه ) رقم : ( ٩٢٠ ) ، والطبراني في ( الصغير ) ص : ( ١٠٨ ) ، وابن نَصْر في ( قيام الليل ) ص : ( ٩٠ ) . وسندهُ حسنٌ في الشواهد .

٤٢٥ ) هاتووە ، پاشان ئەگەر ڕیوایەتی ( **يزيد** ) ( **صحيح** ) بێ ئەوا کردەوەیە و ڕیوایەتی ( **محمد بن يوسف** ) ووتەیە ، ووتەش پێشخراوە لە سەر کردەوە [ القولُ مُقدمٌ على الفعلِ ، كما هو مقرر في علم أصول الفقه ] .

هەروەها ( **عبدالرزاق** ) لە ( **المصنف** ) دا : ( ٧٧٣٠ ) لە ( **داود بن قيس** ) و وجگە لەویش لە( **محمد بن يوسف** ) لە ( **السائب بن يزيد** ) ەوە دەیگێڕیتەوە : " کە ( **عمر** ) خەڵکی کۆ کردوەتەوە لە ڕەمەزاندا بە ئیمامەتی ( **أُبَي بن كعب** ) وە بە ئیمامەتی ( **تميم الداري** ) لە سەر بیست و یەك رکات ، وە لەو سورەتانەیان دەخوێند کە لە (١٠٠) سەد ئایەتیەکان بوون ، وە نزیك دەرکەوتنی فەجر بڵاوەیان لێ دەکرد .

بەڵام ئەم ڕیوایەتە پێچەوانەی ئەوەیە کە (**مالك**) لە (**محمد بن يوسف**) لە (**السائب بن يزيد**) دەیگێڕێتەوە ، وە ڕواڵەتی (**إسناد**)ی ڕیوایەتەکەی (**عبدالرزاق**) (**صحيح**)ە ، چونکە هەموو (**رجال**)ەکانی (**ثقات**) ن .

وە هەندێکیان ئەم ڕیوایەتەی کردۆتە بەڵگە بە گومانی ئەوەی کە فەرموودەکەی ( **محمد بن يوسف** ) ( **مضطرب** ) ە ، ئەوەش بۆ بە لاخستنی ( **محمد بن يوسف** ) و ڕێگە خۆش کردن بۆ ووتەیان بە بیست رکاتی فەرموودەکەی ( **يزيد بن خصيفة** ) .

بەڵام ئەم گومانە ڕەت دەکرێتەوە ، چونکە فەرموودەی (**مضطرب**) ئەو فەرموودەیەیە کە لە لایەن یەك ڕاویەوە دووجار یان زیاتر ، یان لە لایەن دوو ڕاویەوە بە چەند ڕوویەکی جیاواز و نزیك لە یەك و یەکسان بێ ئەوەی یەکێکیان لەوی تریان باشتر دابنرێت دەگێڕرێتەوە [١٩٥] .

ئەم مەرجەش بوونی نیە لە فەرموودەی (**محمد بن يوسف** )دا چونکە ڕیوایەتی (**مالك**) (**أرجح**) ترە لە ڕیوایەتی (**عبدالرزاق**) بە هۆی (**حفظ**)ەوە .

ئەم پێشەکیەمان ووتووە بۆ سەلماندنی بێ گەردی (**إسناد**)ی (**عبد الرزاق**) لە (**العلل**) بەڵام کار پێچەوانەی ئەوەیە ، ڕوون کردنەوەشی بەم پێیەیە :

**أ ـ** ئەوانەی کە کتێبی (**المُصَنَّف**) یان گێراوەتەوە لە (**عبدالرزاق**)ەوە زیاد لە یەك کەسن ، یەکێك لەوانە : (**إسحاق بن إبراهيم بن عباد الدَّبَري**) ە .

**ب ـ** ئەم فەرموودیە لە گێرانەوەی (**الدَّبَري**) یە لە ( **عبدالرزاق** ) ەوە ، وە ئەوە کتێبی( **الصوم** ) ی گێراوەتەوە [١٩٦] .

---

(١٩٥) تدريب الراوي : ( ١ / ٢٦٢ ) .

ج ـ ( **الدَّبَري** ) کاتێك نووسراوەکانی ( **عبدالرزاق** ) ی لێوە بیستووە کوڕێکی حەوت ساڵان بووە [(١٩٧)] .

د ـ (**الدَّبَري**) خاوەنی فەرموودە نەبووە و پیاوی ئەم گۆڕەپانەش نەبوو [(١٩٨)] .

هـ ـ بۆیە هەڵەی زۆر بووە لە گێڕانەوەکانی لە ( **عبدالرزاق** )ەوە ، وە زۆر فەرموودەی ( **منكر** )ی لە ( **عبدالرزاق** ) ەوە گێڕاوەتەوە ، وە هەندێك لە زانایان هەڵەکانی ( **الدَّبَري** ) و گۆڕینەکانی یان ( **تصحيفاتهُ** ) کۆ کردۆتەوە لە ( **المصنف** ) ی ( **عبدالرزاق** ) [(١٩٩)] .

لەوەی پێشووش ئاشکرا دەبێت کە ئەم ڕیوایەتە ( **منكر** )ە چونکە ( **الدَّبَري** ) پێچەوانەی لە خۆی ( **أوثق** ) تری کردووە ، وە ئەوەش کە دڵ بۆی ئارام بگریت ئەوەیە کە ئەم فەرموودەیە لە گۆڕینەکانێتی ، لە یازدە رکاتەوە ، ئەوەشت زانی کە گۆڕینی زۆرە [(٢٠٠)] .

بۆیە ئەم ڕیوایەتە ( **منكر** )ە و گۆڕاوە ، بۆیە کردنە بەڵگەی بەلا دەنرێت ، وە ئەوش جێگیرە لە سوننەتی ( **صحيح** ) ەوە کە دەگێڕێتەوە لە ( **الموطأ** ) : ( ١ / ١١٥ ) بە ( **سند** )یکی ( **صحيح** ) لە ( **محمد بن يوسف** ) لە ( **السائب بن يزيد** ) ەوە ، جا بە ئاگا بە [(٢٠١)] .

## زەکاتی سەرفترە :

### ١ ـ حوکمەکەی :

زەکاتی سەرفترە فەرزە لە بەر فەرموودەی (**ابن عمر**) ﵁ کە فەرموویەتی: " **فَرَضَ رَسُولُ اللهِ ﷺ زَكَاةَ الفِطْرِ [مِنْ رَمَضَان عَلَى النَّاسِ]** [(٢٠٢)] " .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفترەی فەرز کرد بە سەر خەڵکیدا لە مانگی ڕەمەزاندا .

وە لە بەر فەرموودەی ( **ابن عباس** ) ـ ڕەزای خوا لە خۆی و بابیٚ بێت ـ کە فەرموویەتی : " **فَرَضَ رَسُولُ اللهِ ﷺ زَكَاةَ الفِطْرِ** " [(٢٠٣)] .

---

(١٩٦) المُصَنَّف : ( ٤ / ١٥٣ ) .

(١٩٧) ميزان الإعتدال : ( ١ /١٨١ ) .

(١٩٨) ميزان الإعتدال : ( ١ / ١٨١ ) .

(١٩٩) ميزان الإعتدال : ( ١ / ١٨١ ) .

(٢٠٠) وانظر لزاماً : ( تهذيب التهذيب ) : ( ١٠ / ٣١٠ ) ، و ( ميزان الإعتدال ) : ( ١ / ١٨١ ) .

(٢٠١) ولزيادة التفصيل و الرد على الشبهات انظر :

أ ــ ( الكشف الصريح عن أغلاط الصابوني في صلاة التراويح ) ، تأليف : علي حسن علي عبد الحميد ، وهي تحت الطبع .

ب ــ ( المصابيح في صلاة التراويح ) للسيوطي ، بتعليقه ، طبع دار عَمَّار .

(٢٠٢) أخرجهُ البخاري : ( ٣ / ٢٩١ ) رقم : ( ١٥٠٣ ) ، ومسلم رقم : ( ٩٨٤ ) والزيادة له .

وە هەندێك لە زانایان فەرموویانە ئەم فەرموودانە ( **مەنسوخ** ) ن ، لە بەر فەرموودەی ( **قیس بن سعد بن عبادة** ) کە فەرموویەتی : " أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ بِصَدَقَةِ الْفِطْرِ قَبْلَ أَنْ تَنْزِلَ الزَّكَاةُ فَلَمَّا نَزَلَتْ الزَّكَاةُ لَمْ يَأْمُرْنَا وَلَمْ يَنْهَنَا ، وَنَحْنُ نَفْعَلُهُ " .

ئیمامی ( **الحافظ** ) بە ڕەحمەت بێت وەڵامی داونەتەوە لە کتێبی (**الفتح**) دا : ( ٣ / ٣٨٦ ) و فەرموویەتی : (( کە لە ( **إسناد** ) ەکەیدا ڕاویەکی ( **مجهول** ) [٢٠٤] هەیە ، وە لە سەرگریمانی ( **صحیح** ) بوونی بەڵگەی تێدا نیيە بۆ نەسخ کردنەوە ، بە گومانی ئەوەی کە فەرمانی یەکەمی بەس بێت ، وە چونکە فەرز بوونی شتێك پێویست ناکات فەرزێکی تر لا بدات )) .

وە ( **الخطابي** ) بەڕەحمەت بێت لە ( **معالم السنن** ) دا : ( ٢ / ٢١٤ ) فەرموویەتی : (( ئەوە بەڵگە نیيە لە سەر لادانی فەرزێتی ، ئەوەش لە بەر ئەوەی کە زیاد بوونی لە جۆری پەرستنێك وا پێویست ناکات بنەواکە کە زیاد کراوە لە سەری نەسخ بێتەوە ، لە سەر ئەمەش جێگەی زەکات سەروەتو ماڵە ، و جیگەی زەکاتی سەرفترە گەردنەکانە )) .

## ٢ ـ لە سەر کێ واجب دەبێ ؟

زەکاتی سەرفترە ( **واجب** ) دەبێ لە سەر هەموو بچووك و گەورە و ، نێرینە و مێینە و سەربەست و بەندەیەك لە موسوڵمانان ، لە بەر فەرموودەی ( **ابن عمر** ) ـ ڕەزای خوا لە خۆی و بابی بێت ـ کە فەرموویەتی : " فَرَضَ رَسُولُ الله ﷺ زَكَاةَ الفِطْرِ صَاعَاً مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعَاً مِنْ شَعِيْرٍ عَلَى الْعَبْدِ وَالْحُرِّ وَالذَّكَرِ وَالأُنْثَى وَالصَغِيرِ وَالْكَبِيرِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ " [٢٠٥] .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفترەی فەرز کردووە بە بڕی ( **صاع** ) ❁ ێك لە خورما ، یان ( **صاع** ) ێك لە جۆ لە سەر بەندە و سەربەست و نێرینە و مێینە و بچووك و گەورەی موسوڵمان .

وە هەندێك لە زانایان بۆ ئەوە دەچن کە ( **واجب** ) یشە لە سەر بەندێ بێ باوەر ، لە فەرموودەی ( **أبو هريرة** ) ﷺ کە دەگێڕێتەوە : " لَيْسَ فِي الْعَبْدِ صَدَقَةٌ إِلا صَدَقَةَ الفِطْرِ " [٢٠٦] .

واتە : کۆیلە هیچ زەکاتێکی لە سەر نیە جگە لە زەکاتی سەفترە نەبێ.

---

[٢٠٣] أخرجهُ أبو داود رقم : (١٦٢٢) ، والنسائي : (٥/٥٠) ، وفيه عنعنة الحسن ، لكنَّ ما قبله شاهد له.

[٢٠٤] ولكنَّهُ متابع ، فقد أخرجهُ النسائي : (٥ / ٤٩) ، وابن ماجه : (١ / ٥٨٥) ، وأحمد : (٦ / ٦) ، وابن خُزَيمة : (٤ / ٨١) ، والحاكم : (١ / ٤١٠) ، والبيهقي : (٤ / ١٥٩) من طُرُقٍ ، وسندهُ صحيحٌ .

[٢٠٥] أخرجهُ البخاري : ( ٣ / ٢٩١ ) رقم : ( ١٥٠٣ ) ، و مسلم رقم : ( ٩٨٤ ) .

❁ ( صاع ) : بریتی یە لە چوار گوێل بە دەستی پیاوێکی مامناوەند .

[٢٠٦] أخرجهُ مسلم رقم : ( ٩٨٢ ) .

بەڵام ئەم فەرموودەیە گشتی یە و فەرموودەی ( **ابن عمر** ) تایبەتە ( واتە : **خاص** )ە ، زانراویشە کە تایبەت گشتی تایبەت دەکات .

کۆمەڵێکی تر فەرموویانە : (**واجب**) نابێ لە سەر کەس جگە لە ڕۆژووان نەبێ ، لە بەر فەرموودەی (**ابن عباس**) کە دەفەرمووی : " فَرَضَ رَسُولُ اللهِ ﷺ زَكَاةَ الفِطْرِ طُهْرَةً لِلصَّائِمِ مِنَ اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ ، وَطُعْمَةً لِلْمَساكِينِ " (٢٠٧).

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفترەی فەرز کرد لەسەر ڕۆژووانان بۆ پاك کردنەوەیان لە قسەی پڕ و پووچ و خراپەکاری ، وە خواردنێکیش بێت بۆ هەژاران .

( **الخطابي** ) ـ بەرەحمەت بێت ـ لە ( **معالم السنن** ) دا : ( ٣ / ٢١٤ ) فەرموویەتی : (( زەکاتی سەرفترە ( **واجب** )ە لە سەر هەموو ڕۆژوانێك دەوڵەمەندێکی خاوەن سەروەت بێ یان هەژارێك هەی بێ زیادە لە سەر خواردنەکەی ، ئەمە ئەگەر واجب بوونەکەی بە هۆکاری پاك کردنەوە بێ ، و هەموو ڕۆژووانانیش پێویستیان پێیە ، چونکە ئەگەر هەموویان لە هۆکارەکەیدا هاوبەش بن ئەوا لە واجب بوونیش بەشدار دەبن )) .

وە ( **الحافظ** ) وەڵامی داوەتەوە و فەرموویەتی ( ٣ / ٣٦٩ ) : ((باسکردنی پاك کردنەوە دەرچووە لە هۆکارەکان : چونکە سەرفترە واجب دەبێ لە سەر ئەو کەسەی تاوان ناکات ، وەکو پیاوانی جێ بەجێ کەری چاکەکاری یان کەسێك پێش خۆر ئاوا بوون بەساتێك باوەربێنێ)) .

کۆمەڵێکیان بۆ ئەوە دەچن کە سەرفترە (**واجب**)ە لە سەر کۆرپە لە سکی دایکدا بەڵام هیچ بەڵگەیەك بۆ ئەم کۆمەڵەیە نەزانراوە لە سەر ئەو شتە ، چونکە بە کۆرپەڵە ناوترێت بچوك (واتە : **الصغير**) لە زمانەوانی و عورفیشدا .

## ٣ ـ جۆرەکانی زەکاتی سەرفترە :

زەکاتی سەرفترە بە بڕی ( **صاع** ) ێك لە جۆ دەبێ ، یان ( **صاع** ) ێك لە خورما ، یان ( **صاع** ) ێك لە کەشك (( واتە: **إقط** )) ، یان ( **صاع** ) ێك لە مێووژ ، یان جۆی بێ تویك ، ( واتە : **سلت** ) ، لە بەر فەرموودەکەی ( **أبو سعيد الخدري** ) ﷺ کە دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێ : " كُنَّا نُخْرِجُ زَكَاةَ الفِطْرِ صَاعَاً مِنْ طَعَامٍ ، أَوْ صَاعَاً مِنْ شَعِيرٍ ، أَوْ صَاعَاً مِنْ تَمْرٍ ، أَوْ صَاعَاً مِنْ إِقْطٍ ، أَوْ صَاعَاً مِنْ زَبِيْبٍ " (٢٠٨) .

(٢٠٧) تقدم تخريجهُ في التعليق رقم : ( ٢٣٠ ) .

(٢٠٨) أخرجهُ البخاري : ( ٣ / ٢٩٤ ) رقم : ( ١٥٠٦ ) ، ومسلم رقم : ( ٩٨٥ ) .

واتە : زەکاتی سەرفترەمان دەردەکرد لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بە بڕی ( **صاع** ) ێك لە خوادەمەنی ، یان ( **صاع** ) ێك لە جۆ ، یان (**صاع**) ێك لە خورما ، یان ( **صاع** ) ێك لە کەشك ، یان ( **صاع** ) ێك لە مێووژ .

وە لە بەر فەرموودەکەی ( **ابن عمر** ) ـ ڕەزای خوا لە خۆی و بابی بێت ـ کە فەرموویەتی : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : " فرضَ صَدَقة الفِطْرِ صَاعَاً مِنْ شَعِيْرٍ أَوْ صَاعَاً مِنْ تَمْرٍ ، أَوْ صَاعَاً مِنْ سَلْتٍ " (٢٠٩) .

واتە زەکاتی سەرفترە فەرزکرا بە بڕی ( **صاع** ) ێك لە جۆ ، یان (**صاع**) ێك خورما ، یان ( **صاع** ) ێك لە جۆی بێ توێك .

وەزانایان بۆچوونی جیاوازیان هەیە لە ڕاڤە ( **تەفسیر** ) ی ووشەی (**الطعام**) کە لە فەرموودەکەی ( **أبي سعيدالخدري** ) دا هاتووە ﷺ ووتراوە : کە گەنمە ، وە ووتراوە : جگە لەوەش ، بەڵام ئەوەی کە دڵ پێی ئارامە ئەوەیە کە گشتی یە و هەموو شتێکی پێوانە کراوە دەگرێتەوە لە خواردن ، وەکو : گەنم و ئەوجۆرانەش کە لە پێشدا باسکران لە گەڵ ئارد و ئاردەواش کە ( **سويق** ) ە ، وە هەموو ئەوەش کە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەنجام دراوە لە بەر فەرموودەکەی ( **ابن عباس** ) ـ ڕەزای خوا لە خۆی و بابیبێت ـ کە فەرموویەتی : " أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ نُؤَدِّيَ زَكَاةَ رَمَضَان صَاعَاً مِنْ طَعَامٍ عَن الصَّغيرِ وَالْكَبيرِ وَالحُرِّ وَالمَمْلُوكِ ، مَنْ أَدَّى سَلْتَاً قُبِلَ مِنْهُ ، وَأَحْسبُهُ قَالَ : مَنْ أَدَّى دَقيقاً قُبِلَ مِنْهُ ، وَمَنْ أَدَّى سَوِيقاً قُبِلَ مِنْهُ " (٢١٠) .

واتە : پێغەمبەر خوا ﷺ فەرمانی پێ کردین زەکاتی سەرفترە بدەین بە بڕی ( **صاع** ) ێك لە خوادەمەنی بۆ هەر منداڵێك یان گەورەیەك یان سەربەسێتك یان بەندەیەك ، هەر کەسێ جۆی بێ تویکی بدایە لێی وەردەگیرا ، وا بزانم فەرمووی : هەر کەسێ ئاردی بدایە لێی وەردەگیرا ، وە هەر کەسێ ئاردەوای بدایە لێ ی وەردەگیرا .

هەر لەوەوە ﷺ فەرموویەتی : " صَدَقَةُ رمضانَ صاعٌ من طعام ، من جاء بِبُرٍّ قُبِل منه ومن جاء بشعيرٍ قُبِلَ منه ومن جاء بتمر قُبِلَ منه ، ومن جاء بِسَلْتٍ قُبل منه ، ومن جاء بِزَبِيْبٍ قُبِلَ منه ، وأحسبهُ قال : من جاء بسَويقٍ قُبِلَ مِنْهُ " (٢١١) .

---

(٢٠٩) أخرجهُ ابن خُزَيمة : ( ٤ / ٨٠ ) ، و الحاكم : ( ١ / ٤٠٨ — ٤١٠ ) .

والسَّلْت : نوعٌ من الشعير لا قِشْرَ لهُ . واتە : جۆرێکە لە جۆ بەڵام بێ توێکڵە.

(٢١٠) أخرجهُ ابن خُزَيمة : ( ٤ / ٨٠ ) ، بسندٍ صحيح .

(٢١١) أخرجهُ ابن خُزَيمة : ( ٤ / ٨٠ ) ، بسندٍ صحيح .

و من أجل ذلك ترجم له ابنُ خُزَيمة ب ( باب إخراج جميع الأطعمة في صدقة الفِطْر ) .

بەڵام ئەو فەرموودانەی کە گەنمی لێ دەردەکات ، یان ( **معاوية** ) ﵁ وای بینیوە کە دوو گوێل بێ لە گەنمی شام و بەرامبەر بە ( **صاع** ) ێکە ، بەوە لێك دەدرێتەوە کە ئەگەر گەنم کەم بوو وە ئەو جۆرە خواردنانەی تر زۆر بن ، و زۆربەی خواردنیان لەوانە بێ ، ئەوەش پاڵپشتی ئەم واتایە بکات ووتەی ( **أبو سعيد** ) ە کە فەرموویەتی : " وَكَانَ طَعَامُنَا الشَّعِيرُ وَالزَّبِيْبُ وَالأَقطُ وَالتَّمرُ " [٢١٢] .

ئەوەش دەنگی پێچەوانەکار بڕێ ئەمەیە کە دێت دەربارەی ڕوون کردنەوەی بڕی زەکاتی سەرفترە لەو فەرموودە (**صحيح**) و ڕوونانەی کە گەنمی تێدایە و ئەوەی کە دوو گوێل ـ واتە : (**مُد**) ێك ـ لە گەنم بەرامبەر بە چوار گوێل ( واتە : **صاع** ) ێك دەبێ بۆ ئەوەی هەموو موسوڵمانێك کە ڕێز بۆ هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ دادەنێت بزانێت بۆچوونەکەی (**معاوية**) ئیجتهاد نەبوو بەدیدی خۆی بەڵکو پشت دەپەستێت بە فەرموودەی (**مرفوع**) بۆ لای ڕاستگۆی بەڕاست زانراو لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ .

## ٤ ـ بڕەکەی :

هەموو موسوڵمانێك بڕی ( **صاع** ) ێك لە خواردن دەردەکات لەو جۆرە خواردنانەی کە لە پێشدا باسکراون ، وە جیاوازیش هەیە لە گەنم دا ، ووتراوە : نیو ( **صاع** ) ( واتە : دوو گوێل ) ئەمەش بۆچوونی هەڵبژاردەیە و ڕاسترە ، لە بەر فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی : " أَدُّوا صَاعَاً مِنْ بُرٍّ أَو قَمْحٍ بَيْنَ اثنينِ ، أَوْ صَاعَاً مِنْ تَمْرٍ أو صَاعَاً مِنْ شَعِيْرٍ عَنْ كُلِّ حُرٍّ وَعَبْدٍ وَصَغيرٍ وَكَبِيْرٍ " [٢١٣] .

واتە : ببەخشن بڕی ( **صاع** ) ێك لە گەنم لە جیاتی دوو کەس ، یان ( **صاع** ) ێك لە خورما ، یان ( **صاع** ) ێك لە جۆ لە جیاتی هەموو ئازاد و بەندە و منداڵ و گەورەیەك .

وە ( **صاع** )ە کەش کە بو پێوانە دەشێت ( **صاع** )ی خەڵکی مەدینەیە لە بەر فەرموودەی ( **ابن عمر** ) ـ ڕەزای خوا لە خۆی و بابی بێت ـ کە فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " الوَزْنُ وَزْنُ أَهْلِ مَكَّة وَالمكيالُ مكيالُ أهلِ مَدينة " [٢١٤] .

واتە : کێش کێشی خەڵکی مەککەیە ، و پێوانەش پێوانەی خەڵکی مەدینە .

## ٥ ـ پیاو لە جیاتی کێ دەیدا ؟

موسوڵمان سەرفترە دەدات بۆ خۆی و هەموو ئەوانەی کە نەفەقەیان

---

[٢١٢] أخرجهُ البخاري رقم : ( ١٥١٠ ) ، و مسلم رقم : ( ٩٨٥ ) .

[٢١٣] أخرجهُ أحمد : ( ٥ / ٤٣٢ ) عن ثعلبة بن صُعَير ، و سندهُ رجالهُ كُلُّهم ثقات ، و له شاهد عند الدارقطني : (٢ / ١٥١) عن جابر ، بسندٍ صحيح .

[٢١٤] أخرجهُ أبو داود رقم : (٢٣٤٠) ، والنسائي : (٢٨١/٧) ، والبيهقي : (٣١/٦) عن ابن عمر ، بسندٍ صحيح.

لە سەرێتی لە بچووك و گەورە و نێر و مێ و سەربەست و كۆیلە ، لە بەر فەرموودەی ( **ابن عمر** ) ـ ڕەزای خوا لەخۆی و بابی بێت ـ كە فەرموویەتی : " أمر رسول الله ﷺ بصدقة الفطر عن الصغير و الكبير و الحر و العبد ممن تمونون " [٢١٥] .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە زەكاتی سەرفترە كردووە لەجیاتی بچووك و گەورە و سەربەست و كۆیلە لەوانەی نەفەقەی دەدەن .

## ٦ ـ بە كێ دەدرێت ؟

نادرێت بە جگە لەو كەسانە نەبێ كەشایستەیین ، ئەوانیش هەژارەكانن ، لە بەر فەرموودەی : ( **ابن عباس** ) ـ ڕەزای خوا لە خۆی و بابی بێت ـ كە فەرموویەتی : " فَرَضَ رَسُولُ اللهِ ﷺ زَكَاةَ الفطرِ طُهْرَةً لِلصَّائِمِ مِن اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ وَطُعْمَةٌ لِلْمَسَاكِين " [٢١٦] .

هەر ئەم بۆچوونەشە كە ( **شيخ الإسلام** ) لە ( **مجموع الفتاوى** ) دا : ( ٢٥ / ٧١ – ٧٨ ) ، وە قوتابییەكەی ( **ابن القيم** ) لە كتێبی : ( **زاد المعاد** ) دا : ( ٢ / ٤٤ ) هەڵیان بژاردووە .

وە هەندێك لە زانایان بۆ ئەوە دەچن كە بدرێت بە ئەو هەشت كۆمەڵەیەی كە زەكاتیان پێ دەدرێت ، بەڵام ئەمە لەو ووتانەیە كە هیچ بەڵگەیەكی لە سەر نیە ، و ( **شيخ الإسلام** ) لە سەرچاوەی ناو براوی دا لەوەو پێش ، بەر پەرچی ئەم بۆچوونەی داوەتەوە ، جا بگەڕەرێوە بۆی چونكە زۆر گرنگە .

وە سوننەتیشە یەكێك تەرخان بكرێت بۆ كۆ كردنەوەی سەرفترەكە لە لایدا ، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ سپاردوویەتی بە ( **أبو هريرة** ) دا رضي الله عنه كە فەرموویەتی : " أَخْبَرَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ أَحْفَظَ زَكَاةَ رَمَضَان " [٢١٧] .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ڕاگەیاندم كە زەكاتی سەرفترەی ڕەمەزان كۆ بكەمەوە .

وە ( **ابن عمر** ) رضي الله عنه دەیبەخشی بەو كەسانەی وەریان دەگرد ئەوانیش ئەو كارمەندانە بوون كە ( **ئیمام** ) دایدەمەزراندن بۆ كۆ كردنەوەی ، ئەوەیش پێش چەژنی ڕەمەزان بە ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ ، ئیمامی ( **ابن خُزَيمة** ) : ( ٤ / ٨٣ ) لە ڕێگەی ( **عبدالرزاق** ) ەوە لە ( **أيوب** ) ەوە دەگێڕێتەوە : "

---

[٢١٥] أخرجهُ الدارقطني : ( ٢ / ١٤١ ) ، والبيهقي : ( ٤ / ١٦١ ) عن ابن عمر ، بسندٍ ضعيف .

و أخرجهُ البيهقي: ( ٤ / ١٦١ ) من طريق آخر عن علي ، وهو منقطع . وله طريق موقوف عن ابن عمر ، عند ابن أبي شيبة في ( المصنف ) : ( ٤ / ٣٧ ) ، بسندٍ صحيح . فهو ــ بهذه الطُرُق ــ حَسَنٌ .

[٢١٦] تقدم تخريجهُ في التعليق رقم : ( ٢٣٠ ) .

[٢١٧] أخرجهُ البخاري : ( ٤ / ٣٩٦ ) .

قُلْتُ : مَتَى كَانَ ابنُ عُمَر يُعْطِي الصَّاعَ ؟ قَالَ : إِذَا قَعَدَ العَامِلُ ، قُلْتُ : مَتَى كَانَ يَقْعُدُ العَامِلُ ؟ قَـالَ : قَبْلَ الْفِطْرِ بِيَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ " .

واتە : ووتم : کەی ( **ابن عمر** ) ( **صاع** ) ەکەی دەدا ؟ فەرمووی : ئەگەر کارمەندەکان دەستیان بەکار بکردبایە ، ووتم : کەی کارمەندەکان دەستیان بە کار دەکرد ؟ فەرمووی : پێش چەژن بەڕۆژێك یان دوو ڕۆژ .

## ٧ ـ کاتەکەی :

پێش دەرچوونی خەڵکی بۆ نوێژی چەژن دەبەخشرێت [٢١٨] ، وە نابێ دوابخرێت لە نوێژی چەژن ، یان پێش بخرێت جگە لە ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ لە بەر ئەو فەرموودەیەی کە لە کرداری ( **ابن عمر** ) ەوە ﵁ دەگێڕرێتەوە ، لە سەر بنەوای : ( راوي الحديث أَدْرَى بمعنى روايته ) ، وە ئەگەر دوا بکەوێ لە کاتی نوێژ بە بەخشێنێك ( **صدقة** ) یەك لە بەخشینەکان دەژمێررێت ، لە بەر فەرموودەی ( **ابن عباس** ) ـ ڕەزای خوا لە خۆی و بابی بێت ـ کە فەرموویەتی : " ... مَنْ أَدَّاها قَبْلَ الـصَّلاةِ فَهـيَ زَكَاةٌ مَقْبُولَةٌ ، وَمَنْ أَدَّاهَا بَعْدَ الصَّلاةِ فَهِيَ صَدَقَةٌ مِنَ الصَّدَقَاتِ " [٢١٩] .

واتە : ... هەر کەسێك پێش نوێژ بیبەخشێ زەکاتێکی وەرگیراوە ، وە هەر کەسێك دووای نوێژ بیبەخشێ بەخشینێکە لە بەخشینەکان ...

## ٨ ـ حیکمەت لە سەرفترە :

خوای دانا زەکاتی سەرفترەی فەرز کردووە بۆ پاك کردنەوەی ڕۆژووانان لە ووتەی پڕو پووچ و خراپە کاریەکانیان و خواردنێکێش بێ بۆ هەژاران ، بۆ پڕ کردنەوەی کەم کوڕیەکانیان لەو ڕۆژە پرشنگ دارە ، لە بەر فەرموودەی ( **ابن عباس** ) ﵁ کە لە پێشدا باسکرا .

---

[٢١٨] راجع كتاب ( **أحكام العيدين في السنة المطهرة** ) ، تأليف : علي حسن علي عبد الحميد ، طبع المكتبة الإسلامية .

**تێبینی** : سەرنجی خوێنەرانی بەڕێز بۆ ئەوە ڕادەکێشم کە ئەم کتێبە بەنرخە لە لایەن مامۆستا : (**صلاح الدين عبد الكريم**)ەوە وەرگێڕراوەتە سەر زمانی کوردی لە ژێر ناو نیشانی : (**حوکمەکانی هەردوو جەژنەکە لە سوننەتی پاکژ کراودا**) بە هیوای سود لێوەرگرتنی . ـ وەرگێڕ ـ

[٢١٩] تقدم تخريجهُ .

# چەند فەرموودەیەکی لاواز ( ضیعف ) کە لە ڕەمەزاندا بڵاو دەبێتەوە :

بە باشمان زانی ئەم بەشەش زیاد بکەین لە سەر کتێبەکەمان بە هۆی ئەو گرنگییە ئاشکرایەی کە هەیەتی ، بۆ ئاگادار کردنەوەی خەڵکی و ئاشکرا کردنی حەق ، بۆیە دەڵێین : خوای بێ گەرد و پایە بەرز هەڵگرانێکی داد پەروەری تەرخان کردووە بۆ سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی لە گۆڕینی ناڕەوایان ( **تحريف المبطلين** ) پاکی بکەنەوە ، وە لە ڕاڤەی زیادڕەوی کەران ( **تأويل الغالين** ) بیپارێزن ، وە درۆی خراپەکارانی ( **تزييف الزائفين** ) تێدا ئاشکرا بکەن .

سوننەتەکانی پێغەمبەریش ﷺ بە درێژی سەدەکانی پێشوو زۆر خڵتەی تێکەڵ کراوە ، لە ( **ضعيف** ) و ( **مكذوب** ) و ( **مُفْتَرَى** ) واتە لاواز و بەدەمەوە نراو هەڵ بەسترا و هاوشێوەکانی ، ئەو شتانەی کە پێشەوایانی ڕابردوومان ، و زانایانی پێشینمان ئاشکرایان کردووە بە باشترین شێوە ، و ئاشکراترین ڕوونکردنەوە هەر کەسێکیش لەم ڕۆژانەدا بڕوانێتە دونیای نووسەران و ئامۆژگاری کاران ، ئەبینێت ـ ئیللا ئەو کاسانەی نەبێت کە خوا ڕەحمی پێ کردوون ـ هیچ گرنگی یەکیان نەداوەتە ئەم بابەتە گرنگە ، سەرەڕای بەر بڵاوی سەرچاوە زانستی یەکان کە تایبەتن بە دیاری کردنی (**صحيح**) و ئاشکرا کردنی زیادکراوەکان .

وەلە نیازماندا نیە درێژە بدین بە باسی ئەم بابەتە و ئەو شتانەش کە بنیات دەنرێت لە سەری ، لە شوێنەواری خراپە لە سەر زانست و خەڵکیش لە گەڵ یەکدا ، بەڵکو تەنها چەند نموونەیەك لەو فەرموودە زیاد کراوانە باس دەکەین کە بە شێوەیەکی گەورە ناسراون لە ناوخەڵکیدا .

بە شێوەیەك تۆ ناتوانی بخوێنیتەوە یان گوێت لە ڕێنموییەك بێ ئیللا وە ئەم فەرموودە ( **ضعيف** ) انە جێگایەکی بڵند دەگرنەوە لێیان ـ ئەوە زۆر بەداخەوە ـ وە بۆ ئیش پێ کردن بەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرمووێ : " بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آية " [٢٢٠] ، وە بەو فەرموودیەی کە فەرموویەتی : " الدِّينُ النَّصيحة " [٢٢١] .

## بە پشتیوانی خوا دەڵێین :

ئەو فەرموودە لاوازانەی کە بڵاوبوونەتەوە لە نێوان خەڵکیدا بە هەموو چینەکانیەوە ، زۆر زۆرن ، بە شێوەیەك فەرموودە ( **صحيح** ) کانیش باس ناکرێت ـ لە گەڵی ئەوەی چەند زۆریشن ـ وە وازیش ناهێنن لە باسکردنی لاوازەکان ، ڕەحمەتی خوا لە ئیمامی ( **عبدالله بن المبارك** ) بێ کە فەرموویەتی :

---

(٢٢٠) أخرجهُ البخاري : ( ٦ / ٣٦١ ) رقم : ( ٣٤٦١ ) .

(٢٢١) أخرجهُ مسلم رقم : ( ٥٥ ) .

(( فەرمووده ( **صحيح** ) هكان بەسن بۆ ئەوەی خۆ خەريك نەكری بە لاوازەكانەوە )) ، با ئەم پێشەوايە سەر مەشقی ئيمە بێ ، و ڕێگەشمان زانستی ( **صحيح** ) ی هەڵبژێردراو پوخت كراو بێت .

**لەو فەرمووده ( ضعيف ) انە كە باسكردنان بڵاو بووەتەوە ، لە نێوان خەڵكی لە ڕەمەزاندا :**

**١ ـ (( لو يعلمُ العبادُ ما في رمضان لَتَمَنَّت أُمَّتي أنْ يكونَ رمضانُ السنةَ كُلَّهَا ، إِنَّ الجنةَ لتزين لرمضان من رأس الحول ... )) [٢٢٢] هتد . فەرموودەكەش فەرموودەيەكی درێژە .**

**هەروەها لەو فەرموودانە :**

**٢ ـ (( يا أيها الناس قد أظلكم شهر عظيم ، شهرٌ فيه ليلةٌ خير من ألف شهر ، جعل الله صيامه فريضة و قيام ليله تطوعاً ، من تقرب فيه بخصلة من الخير كان كمن أدى فريضة فيما سواه ... و هو شهر أوله رحمة ، و وسطه مغفرة ، و آخره عتق من النار .. )) [٢٢٣] هتد .**

وە ئەم فەرموودیەش فەرموودیەكی درێژە ، و تەنها ئەو ووتانەمان هێناوەتەوە كە بڵاو بووتەوە .

**هەروەها لەو فەرموودانە :**

**٣ ـ (( صُومُوا تَصحُّوا )) .ئەمەش پارچەيەكە لە فەرموودەيەكی ( ضعيف ) [٢٢٤] .**

**وە دوا فەرموودەيش :**

**٤ ـ " مَنْ أفطر يوماً من رمضان من غير عذر ولا مرض لم يقضه صوم الدهر وإن صامه " [٢٢٥] .**

---

[٢٢٢] هذا الحديث رواه ابن خُزَيمة رقم : ( ١٨٨٦ ) ، وابن الجوزي في ( كتاب الموضوعات ) : ( ٢ / ١ / ١٨٩ ) وأبو يعلى في ( مُسنده ) ، كما في ( المطالب العالية ) : ( ق ٤٦ / أ ـــ ب / النسخة الخطوطة ) من طريق جرير بن أيوب البجلي عن الشعبي عن نافع بن بردة عن أبي مسعود الغفاري .

وهذا حديثٌ موضوعٌ ، آفتهُ جرير بن أيوب ، ترجمهُ ابن حجر في ( لسان الميزان ) : ( ٢ / ١٠١ ) وقال : ( مشهور بالضعف ) ثُمَّ نقل عن أبي نعيم قولهُ فيه : ( كان يصنع الحديث ) وعن البخاري قولهُ : ( منكر الحديث ) وعن النسائي : ( متروك ) !!! وحكم عليه ابن الجوزي بالوضع ، وقال ابن خُزَيمة بعد أن رواه : ( إن صح الخبر ، فإن في القلب من جرير بن أيوب البجلي ) .

[٢٢٣] وهذا الحديث رواه أيضاً ابن خزيمة رقم : (١٨٨٧) ، والمحاملي في (أماليه) رقم : (٢٩٣) ، والأصبهاني في (الترغيب) : (ق/١٧٨، ب/النسخة المخطوطة) من طريق علي بن زيد بن جدعان عن سعيد بن المسيب عن سلمان . وهذا إسناد ضعيف لضعف علي بن زيد ، قال ابن سعد : ( فيه ضعف ، و لايُحتَّجُ به ) ، وقال أحمد بن حنبل : (ليس بالقوي) ، وقال ابن معين : (ضعيفٌ) ، وقال ابن أبي خيثمة : ( ضعيف في كل شيْ ) ، وقال ابن خزيمة : ( لا أحتج بهِ لسوء حفظه ) كذا في (تهذيب التهذيب) : ( ٧ / ٣٢٢ ـــ ٣٢٣ ) . وقال ابن خزيمة بعد روايته لهُ : (إنْ ۞ صح الخبر) وقال ابن الحجر في ( الأطراف) : ( و مدارهُ على علي بن زيد بن جدعان ، وهو ضعيفٌ ) ، كما نقلهُ عنه السيوطي في ( جمع الجوامع ) رقم : (٢٣١٤ ـــ ترتيبه) . ونقل ابن ابي حاتم عن أبيه في (علل الحديث) : ( ١/ ٢٤٩ ) : (حديث منكر) .

۞ وسقطت ( إِنْ ) من بعض المراجع ، ك ( الترغيب و الترهيب ) : ( ٢ / ٩٥ ) و غيره ! فأفسد سقوطُها المعنى !! واغترَّ بها بعض المتعالمين !!!

[٢٢٤] وهو قطعة من حديث ابن عدي في ( الكامل ) : ( ٧ / ٢٥٢١ ) من طريق نهشل بن سعيد ، عن الضحاك ، عن ابن عباس . ونهشل متروك كان يكذب ، والضحاك لم يسمع من ابن عباس .

والطبراني في ( الأوسط ) : ( ١/ ق ، ٦٩/ أ- مجمع البحرين ) ، وأبو نعيم ) في ( الطب النبوي ) ـــ كما في ( تخريج الاحياء ) : ( ٣ / ٨٧ ) ـــ وابن بُخيت ( جزءه ) في ( شرح الاحياء ) : ( ٧ / ٤٠١ ) ـــ من طريق محمد بن سليمان بن أبي داود ، عن زهير بن محمد ، عن سهيل بن أبي صالح ، عن أبي هريرة .

وسندهُ (ضعيف) ، قال أبوبكر الأثرم : (سمعت أحمد ـــ وذكر رواية الشاميين عن زهير بن محمد ـــ قال : يروون عنه أحاديث مناكير هؤلاء) ، وقال أبو حاتم : (في حفظهش سوءٌ ، وكان حديثهُ بالشام أنكر من حديثه بالعراق لسوء حفظهش) ، وقال العجلي: (وهذه الأحاديث التي يرويها أهل الشام عنه ليست تعجبني) كذا في (تهذيب الكمال) : (٤١٧/٩) . قلتُ : ومحمد بن سليمان شامي مُترجم في (تاريخ دمشق) : (١٥/ ق ٣٨٦ - النسخة المخطوطة) فريوايته عن زهير ـــ كما نص الأئمة ـــ منكرة ، وهذا الحديث منها !!!

[٢٢٥] وهذا حديثٌ علَّقهُ البخاريُ في ( صحيحه ) : ( ٤ / ١٦٠ ـــ فتح الباري ) دون إسناد .

وە پاشان ئەم چوار فەرموودەیە کە زانایان بە ( **ضعيف** ) یان داناوە ، و پێشەوایان بە پوچەڵیان زانیون ، لە گەڵ ئەوەش دا دەیان بیسین و دەیان خوێنینەوە لە هەموو ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز بە تایبەتی و جگە لەویش بە گشتی .

شاراوەش نیە کە هەندێك لەم فەرموودانە واتای ڕاست دەگرنە خۆیان ، کە لە شەرع دا هاتووە لە قورئاندا بێت یان لە سوننەت دا ، بەڵام ئەمە بە تەنها نابێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی ووتەیەك بدرێتە پاڵ پێغەمبەر ﷺ کە نەیفەرمووە ، وە بە تایبەت ـ شوکر بۆ خوا ـ تەنها ئەم ئوممەتەیە لە نێوان ئوممەتانی تردا خوای پاك و بێگەرد تایبەتی کردووە بە ( **الإسناد** ) ، کە بە هۆیەوە فەرموودەی وەرگیراو ( **مقبول** ) لە زیاد کراو ( **المدخول** ) دەناسرێتەوە ، وە ( **صحيح** ) و ( **قبيح** ) یش لە یەك جیا دەکرێتەوە ، ئەم زانستەش زانستێکی زۆر وردکارە ، وە ڕاستی فەرمووە ئەو کەسەی کە ناوی ناوە بە : [ منطق المنقول ، وميزان تصحيح الإخبار ] .

## کۆتایی

خوای پەروەردگار باشترین کۆتایی مان بە قسمەت بکات ، برای پەرۆش بۆ گوێڕایەڵی پەروەردگاری زیندووی بە توانا ، ئەمەیە ﴿ چۆنێتی ڕۆژووی پێغەمبەر ﷺ ﴾ لە پێش دەستت ، وە ڕێنموویەکانی لە ڕۆژووی ڕەمەزاندا لات شاراوە نیە ، جا پێشبڕکێ بکە بۆ دەروازەکانی چاکە و گوێڕایەڵ بە ، وە ڕای گەیەنە ئەوەی کە خوای پەروەردگار پێی بەخشیوی لە تێگەیشتن بۆ ئەوەی گواناه بار نەبێت .

وسبحانك اللَّهُمَّ وبحمدك

أشهد أنْ لا إله إلاّ الله أستغفرك وأتوب إليك

**٢٥ ی / ڕەمەزانی خێر / ١٤٠٣ ك**

=====================



---

وقد وصلهُ ابن خُزَيمة في ( صحيحه ) رقم : ( ١٩٨٧ ) ، و الترمذي رقم : ( ٧٢٣ ) ، و أبو داود رقم : (٢٣٩٧ ) ، وابن ماجه رقم : ( ١٦٧٢ ) ، والنسائي في ( الكبرى ) كما في ( تحفة الأشراف ) : ( ١٠ / ٣٧٣ ) ، والبيهقي: ( ٤ / ٢٢٨ ) ، وابن حجر في ( تغليق التعليق ) : ( ٣ / ١٧٠ ) من طريق أبي المطوس ، عن أبيه ، عن أبي هريرة .
وقال ابن حجر في ( فتح الباري ) : ( ٤ / ١٦١ ) : (واخْتُلِفَ فيه على حبيب بن أبي ثابت اختلافاً كثيراً ، فحصلت فيه ثلاث علل : الإضطراب ، والجهل بحال أبي المطوّس ، والشك في سماع أبيه من اأبي هريرة ) . وقال ابن خُزَيمة بعد روايته : ( إِنْ صح الخبر ، فإني لا أعرف المطوس و لا أباه ) ، فالحديث ضعيفٌ أيضاً .